**زنجیرەی کتێبی دەزگای چاپو پەخشی سەردەم**
**کتێبی گیرفانی ژمارە ( ٣٨ )**

**سەرپەرشتیاری گشتیی زنجیرە**
**ئازاد بەرزنجی**

# کیرکەگۆر

نووسینی: پۆڵستراتێرن
وەرگێڕانی: ئازاد بەرزنجی
بابەت: لێکۆڵینەوەی فەلسەفی
بەڕێوەبەری هونەری: شیروان تۆفیق
مۆنتاژی کۆمپیوتەری: سەیران عەبدولرەحمان
تیراژ: ٧٠٠ دانە
ژمارەی سپاردن : ی ٢٠٠٣



www.sardam.net

# پێڕست

# پێشەکی

**کیرکـەگۆر[*]، بـە مانـای ڕەسمیـی ئـەم وشـەیە، فەیلەسووف نەبوو. لەگەڵ ئەمەشدا لـە شتگەلێك دوا کە بە زۆری دەچنە بواری فەلسەفەوە. ئەو لە بـارەی جیهانــەوە نەینووســی، بـەڵکو لـە بـارەی ژیانەوە —واتـا ئـەوەی کـە ئێمـە چۆن دەژین و چ جۆرە ژیانێك هەڵدەبژێرین.**

---

[*] کیرکـەگۆر لـە زمـانی دانیمارکیدا بە مانـای "گۆڕسـتان" دێ ئـەو شـێوە گوتنەیـە کـە گـەلێ لـە وەرگێـڕە بیانیـەکان پەسـەندیان کـردووە، دەنـا لـە زمـانی دانیمارکیـدا بـە (کیاگەگۆ) تەلەفوز دەکرێت. ئـەم نـاوە لـە ئینگلیزیـدا بـووە بـە Kierkegaard و لـە عەرەبیـدا بـووە بـە (کیرکجـارد) و فارســیش دەڵێــت (کیرکیگــۆر). خوێنــەری کــوردیش لەبەرئــەوەی زیـاتر لــە ڕێــی هــەردوو زمـانی عــەرەبی و فارسییەوە شتی سەبارەت بەم فەیلەسووفە خوێندۆتـەوە“ ناوەکەش بەو شێوەیە لە زەینیدا تۆمار بووە.—و. کوردی.

کیرکــــەگۆر لــــە "مانــــای زینــــدووبوون"ی کۆڵییــەوە. بابــەتی ســەرەکیی باســەکانی "تاکــە کەس و بوونی ئەو"، یان بە واتایەکی دی بابەتی "بــوون" بــوو. بــە بۆچــوونی کیرکــەگۆر ئــەم بوونــــەوەرە تــــەواو خودگەرایــــە لــــە ســــەروو لێکدانــــەوەی ئــــەقڵ و، مــــەنتق و، سیســــتمە فەلســــەفیەکان و، خوداناســــی (تیۆلــــۆجی) و تەنانەت "لافلێدانە دەروونناسییەکان"یشـەوەیە. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا سەرچاوەی هەموو ئەم بابەتانەشـە. هـەر ئـەم تێڕوانینەشـی بووەتـە هـۆی ئـەوەی کـە فەیلەسـووفان و خوداناسـان و دەروونناسـان سـەردەمانێك خۆیـان لـە کیرکـەگۆر تەبەڕا بکەن.

ئــەو لقــە فەلســەفیە (یــان "نافەلســەفیە" بــە قسـەی ئەوانـەی خوازیـاری فەلسـەفەی پـەتین)ی کیرکـەگۆر دایمەزرانـد، نـاونرا بوونگـەرایی (یـان بوونخــوازی–وجودیــەت– ئێگزیستانســیالیزم). هەڵبــەت ماوەیــەکی زۆری خایانــد تــا ڕێبــازی بوونگەرایی بە تەواوی جێی خۆی گـرت. هەنـدێ لــە فەیلەســووفانی وەکــو نیچــە، هۆســێرل و

هایدیگەر (لە ڕوانگەی بوونگەراکانەوە) بە بێ ئەوەی بە خۆیان بزانن بوونگەرا (وجودی) بوون. هایدیگەر نکووڵیی لەمە کرد. نیچەش بەرلەوەی کەسێك ئەو ناوەی بە سەرا دابڕێت" مرد. سەدەیەك دوای مەرگی کیرکەگۆر و بەدەرکەوتنی ژان پۆڵ سارتەر لە فەرەنسادا و لە دووەم جەنگی جیهانیدا بوو کە ڕێبازی بوونگەرایی بە ڕەسمی ناسراو جێگیر بوو.

ڕۆشنبیرانی پاریسی دوای جەنگ دووچاری نائومێدییەکی قووڵ بووبوون. بەلای ئەوانەوە چیتر شتێك نەمابوو جێی باوەڕ بێت. سوریالیزمیش کە بە ڕەهەندە سەیر و سەمەرەکەیەوە بۆ ماوەیەك توانیبووی ڕێ و شوێنێك بۆ خۆی پەیدا بکات" بووبوو بە مایەی گاڵتەپێکردن. بە گرتنەدەستی دەسەڵاتیش لە لایەن ستالینەوە" ڕۆشنبیرانی فەرەنسایی بە لایانەوە زەحمەت بوو چیدی باوەڕ بە کۆمۆنیزمیش بکەن (گەرچی لەم بوارەدا هەوڵیان دا). لە هەلومەرجێکی وادا بوو کە نۆرەی ڕێبازی بوونگەرایی هاتبوو، ئەو ڕێبازەی کە لە بنەڕەتدا

کەسی ناچار بە باوەڕکردن بە شتێك نەدەکرد و تەنانـــەت لەمـــەش زیـــاتر، ڕایدەگەیانـــد کـــە "نائومێدی" بەشێکە لە "دۆخی مرۆیی".

بـەمجۆرە بـوو کـە ڕێبـازی بوونگـەرایی بـە دەرچـوون لـە کافیتریاکـانی پاریسـەوە جیهـانی گرتـەوە و بـەرەو کافیتریاکـانی گرینـویچ ویلـج و لەندەن و مۆڵگەی لاوە ڕافزی و یاخیەکانی سان فرانسیسـکۆ چـوو و سـەرەنجامیش بـووە جێـی بایەخی  کۆڕ و کۆبوونەوە زانکۆییەکانی هەردوو بەری ئۆقیانووسی ئەتڵەسی. بەم شێوەیە ڕێبازی بوونگەرایی لـە یـەك کاتـدا بـوو بـە فەلسـەفەیەکی کافیتریـایی و هـەروەها زانکـۆییش، ئاوێتەیـەکی نائاسـایی لـە لافلێـدەرانی سـاختە تـا بـاس و لێکۆڵینەوەی گەلێ قووڵ و ڕۆشنگەرانە. هـەر لـەم ڕووەشـەوە بـوو کـە بوونگـەرایی تـوانیی هـەم هونەرمەندان و نووسەران و فەیلەسووفان و هـەم کەسانی لافلێدەر و ساختەکاریش بـەلای خۆیـدا ڕابکێشێت، کە هـەموو ڕۆڵیان لـە پەرەسـەندنیدا هـەبوو. بـەم جـۆرە ڕێبـازی بوونگـەرایی بـووە پێشـــڕەوی ڕێبازگـــەلێکی فیکریـــی وەکـــو

ڕەفتارگـــــەرایی و بونیادگـــــەرایی و پـــــاش بونیادگەرایی، کە لـە دەیـەکانی دواتـری سـەدەی بیستدا برەویان سەند.

کرۆکـــی فەلســـەفیی بنچـــینەیی ڕێبـــازی بوونگەرایی کە مەسەلەی بوونە بە بەرەنجامێکی سەدەی بیست دەژمێردرێ، ئەو سەدەیەی کە بـە لەخۆبێگانـــەبوون (نـــامۆبوون) و نیگـــەرانی و تێکشـــکان و بێبـــەهایی نەریتـــەکان دەناســـرێ. لەگەڵ ئەمەشدا، هەموو ئەم شتانە ڕاستەوخۆ لـە کیرکەگۆرەوە سەرچاوە دەگرن" کە نزیکـەی سـەد ساڵ بەر لە سارتەر هاتبووە دونیاوە.

هەرچـەندە گومـان لـەوەدا نییـە کـە کیرکـەگۆر بیرمەندێك بوو پێش سەردەمەکەی خۆی کەوتبوو" بەڵام یەکێك لە کۆنترین پرسیارەکانی کرد بە خاڵی دەســپێکردنی ڕامانــەکانی خــۆی، کــە ئــەویش پرســیاری "بــوون" چـیییەیە؟ ئـەم پرســیارە لای هەموو دەخرایە ڕوو بە تـەنها لای فەیلەسووفەکان نەبێت. چونکە فەیلەسووفەکان ئەم پرسیارەیان بە پێکەنینهێنـەر و نابـەجێ دەزانـی و یـان وایـان لـە قەڵــەم ئــەدا کــە لــە سیســتمی فەلســەفییانەدا

چارەسـەر کـراوە و پێویسـت بـە خسـتنەوەڕووی ناکات.

به بۆچوونی کیرکەگۆر نەك بە تەنها پێویستە هەموو کەسێك ئەم پرسیارە بکات" بەڵکو ناچارە کە ژیانی خۆیشی بە وەڵامێکی "خودی"ی ئەم پرسـیارە بزانێـت. ئـەم پێداگرتنـەی کیرکـەگۆر لەسەر "خودێتی" گرنگترین بەشداریکردنی ئەوە لە فەلسەفەدا.

"مەسەلەی بوون" تەوەری بیرکردنەوەی گـەلێ لە فەیلەسووفان بووە لە ڕابردوودا. لـە ڕاستیدا، بەرلــەوەی ســوکرات و ئــەفلاتوون تــوخمی ئەقڵانیەت بهێننە نـاو فەلسـەفەوە، فەیلەسـووفان لەگەڵ "مەسەلەی بوون"دا دەستەوئێخە ببوون و" پرسیاری ئەوەش کە مانای زیندووبوون چییە و بـوون چـی دەگەیـەنێت" زۆربـەیانی سەرسـام کردبوو. هەڵبـەت هەرچـەند ئـەمڕۆ گـەلێ لەوانـەی ئـەهلی فەلسـەفەن لـەو بڕوایەیانـەوە بـەوەی کـە ئەمجۆرە پرسیارانە بێمانا و پێکەنینهێنـەرن" بە سـادەیی بەلایانـدا تێدەپـەڕن، بـەڵام ئێمـەی بوونـەوەری فـانی و ڕوو لـە نـەمان هـەر بـە

سەرسەختیەوە لەسەر ئەو پرسیارانە بەردەوامین و تەنانـەت هەنـدێك زۆر بـە جیدییـەوە چـاوەڕێن فەلسـەفە وەڵامـی ئـەو پرسـیارانەیان بداتـەوە. هەندێ لە فەیلەسووفانی بەر لە سوکراتیش" بەبێ ئەوەی ئاگایان لە ئاڵۆزییەکانی فیکری فەلسەفیی داهـاتوو بێـت" سـەرگەرمی وەڵامدانـەوەی جیدییانەی ئەمجۆرە پرسیارانە بوون.

پارمنیـدس کـە لـە سـەدەی پێنجـەمی بـەر لـە زاییـنـدا لـە کۆڵۆنیـەکی یۆنانیـدا لـە باشـووری ئیتالیـادا (کـە پێیـان دەوت ئیلیـا) دەژیـا، بـڕوای وابـوو کـە "بـوون" تـوخمێکی تاقانـە و نـەگۆڕی گشت وجودە، بە واتایەکی دی بە بۆچوونی ئـەو "هـەموو شـتێك یـەك شـتە". شـتی وەکـو فرەچەشـنی و گـۆڕان و جووڵـە جگـە لـە دیـاردەی ڕووکەش هیچی دی نین.

فەیلەسـووفە یۆنانیـەکانی تـری پـێش سوکراتیش پرسیاریان لە بارەی جیاوازیی بوونی شـتی "واقیعـی" و چـەمکە ئەبسـتراکت و شـتە خەیاڵیەکانەوە دەکرد. چ چۆنێتییەك بوونی من لە بوونی خەونەکان یان چەمکە زەینیەکانی وەکو

ماتماتیك جیادەكاتەوە؟ لە بنەڕەتدا "هەبوون" (بەو مانایەی كە بوونت هەبێت –و–) یانی چی؟ پاشان نۆرە هاتە سەر سوكرات و ئەفلاتون. ئەو گوتەیەی كە دەڵێت "خۆت بناسە" لە جێی ئەوەی كە "خود" خۆی لە ئەسڵدا چییە" بووە بابەتی ڕۆژ و "مەسەلەی بوون" لە مەیدانی فەلسەفەدا ون بوو. بەم شێوەیە بابەتی سەرەكی و بگرە سەرەكیترین بابەت بە سادەییەوە پشتگوێ خراو ئەوەندەی پەیوەندیی بە ئەفلاتونیشەوە هەبێت بوون بە سادەییەوە بە مەسەلەیەكی پێدراو و پێویست دەژمێردراو پرسیار سەبارەت بە سروشت و ماهیەتی نەدەكرا. ئەكرێ لافی ئەوە لێبدرێ كە ئەفلاتون گشتگیرترین و قووڵترین هزری فەلسەفیی هەموو سەردەمەكان بوو. ئەو چۆن توانیبووی بەوپەڕی سادەییەوە بەلای گرنگترین پرسیاری فەلسەفیدا تێپەڕێت (هەرچۆن ئینشتاین پیشانی داین كە نیوتن، كە گشتگیرترین و قووڵترین هزری زانستیی هەموو سەردەمەكان بوو، جیهانە فیزیاییەكەی لەسەر بناغەی گریمانەیەكی هەڵە

بنيـــات نـــابوو). لەگـــەڵ ئەمانەشـــدا و ويـــڕای بيروبـــاوەڕی بـــاوی هاوچـــەرخيش، لـــە ڕاســـتيدا شـــتێك هەيـــە پێـــی دەڵـــێن پێشـــكەوتنی بنـــەڕەتی، وەك چـــۆن ئـــەمڕۆ ئێمـــە لـــە هـــەموو بوارەكانـــدا زۆر زياتر لە پێشينانمان شت دەزانين، بەڵام لە بواری تێگەيشتنی "بوون"دا بەو جۆرەی كە كيركەگۆر لێـــیَ دواوە، تێگەيشـــتنمان هـــيچ پێشـــكەوتنێكی بەخۆيـــەوە نـــەديوە. دەتـــوانين بڵـــێين ئەوەنـــدەی پەيوەنديی بە تێگەيشتنی "بـوونی خودگـەرا"وە هەبێت، هيچ پێشكەوتنێك نابينين. ئێمە ئەمڕۆ لە هـــەمان دۆخـــدا ئـــازار يـــان لـــەززەت دەچـــێژين كـــە پێشينانمان لەگەڵيدا ڕووبەڕوو بوونەتـەوە: واتـە دۆخی مرۆيی.

پـــــاش ئـــــەفلاتونيش فەيلەســـــووفانی دی درێـــژەيان بـــە گوێنـــەدان بـــەم دۆخـــە مرۆييـــە دا. بـــوونی خودگـــەرا، كـــە دەشـــیَ خـــاڵی هاوبەشـــی گومانلێنەكراوی هەموو مرۆڤەكان بێت، لـە لايـەن فەيلەســـووفە ســـادە لەوحەكانـــەوە بايـــەخی پـــیَ نەدرا. دەسەڵاتی بیَ ڕكابەری هزری ئـەفلاتون و ئەرستۆی قوتابيی، تا نزيكەی دوو هەزار ساڵ لە

مەیدانی فەلسەفەدا درێژەی خایاند. تەنها لە سەدەی حەڤدەیەمی زایینیدا بوو کە فەیلەسووفان گەڕانەوە بۆ ئەو بابەتە سەرەکی و بنەڕەتییەی کە خاڵی دەسپێکردنی هزری فەلسەفی بوو، واتە بۆ پرسیاری "من کێم؟" و کاتێکیش دەڵێین "من هەم" مەبەستمان چییە.

فەیلەسووفی فەرەنسایی "ڕینێ دیکارت" ڕایگەیاند کە "من بیردەکەمەوە، کەواتە من هەم". بە بۆچوونی ئەو هەرچی لە هۆش و لە جیهاندایە مایەی شك و گومانە و دەشێ بە جۆرێك لە جۆرەکان وەهم یان خەیاڵی فریودەر بن، تەنها ئەم "من"ە نەبێت کە بیر لە هەموو ئەوانە دەکەمەوە. بەمجۆرە و لەم ئاقارەدا دەبینین کە بۆ جارێکی دیکە، ئەو بابەتە سەرەکیە، ئەو بەردی بناغە قایمەی کە هەموو فەلسەفەکان دەیانتوانی لە سەری دابمەزرێن، خۆی خستەوە ڕوو: "منی خودگەرا". بەلام تەنانەت لەم ئاقارەی دیکارتیشدا“ دەتوانین کاریگەریی تەوژمی ڕۆشنبیریی ئەو سەردەمە ببینینەوە. لەبەرئەوەی ئەم "من"ە بە تەنها کاتێك هەیە کە

"بیردەکاتەوە". هەستەکان، پەیبردنەکان، هەموو ئەمانە قابیلی هەڵە و گومڕابوونن. بە تەنها منی خودگەرا دەیتوانی لە هەبوونی خۆی دڵنیابێت، نەك شتێکی دی. ئەم "من"ە ڕووت و بێ پشتیوانە و لەبەردەم کاری لە چەشنی فریو و گومڕایی و هەڵەدایە.

سەرەنجام ئەمانۆییل کانت توانیی هێلانە و داڵدەیەکی شایستە بۆ ئەم بوونەوەرە بەدبەخت و بێ پشتیوانە بدۆزێتەوە. کانت لەسەر بنچینەی ئەقلانیەت کۆشکێکی شکۆمەندی لە سیستمێکی فەلسەفیی جیهانگیر بیناکرد" تا ببێتە ماڵ و پەناگەیەکی بالا بۆ ئەم "منی خودگەرا"یە. پاش کانتیش، هیگل سیستمێکی فەلسەفیی گەورەتری دروست کرد کە لە سەر بناغەی ئەم باوەڕە بەند بوو کە "ئەوەی ئەقلانییە واقیعییە و ئەوەی واقیعییە ئەقلانییە".

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، هەم کانت و هەم هیگل لەو هەوڵە گەورانەیاندا، سەرلەنوێ پرسیارە سەرەکیەکەیان فەرامۆش کرد و

فەلسەفەی هیچیان وەڵامێکی قەناعەتپێکەری ئەو پرسیارەی نەدایەوە کە "بوون چییە".

هەر سیستمێکی هزریی ئەقڵانی لە بنەڕەتدا گریمانەی بە ئەقڵانیبوونی جیهانی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتووە. سیستمێکی لەمجۆرە، وەڵامی ئەقڵن بۆ پرسیارەکانی ئەقڵ. "منی خودگەرا" لەودیو ئەقڵەوەیە و بەم پێیەش بە تەواوی بەشێك نییە لە جیهان. کیرکەگۆر بە مەزەنە پەی بەمە برد. ناتوانین لە ڕێی دروستکردنی ئەو سیستمانەوە کە هەموو شتەکان ڕووندەکەنەوە وەڵامی پرسیاری "بوون" بدەینەوە. پرسیاری لە جۆری "بوون چییە" لە گوتاری قووڵترەوە سەرچاوە دەگرێت.. مانای بوون چییە؟.. کیرکەگۆر بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە هاتە مەیدانەوە.

## ژیان و کارەکانی کیرکەگۆر

سۆرین کیرکەگۆر لە ٥ی ئایاری ١٨١٣دا لە کۆپنهاگن هاتە دونیاوە، هەر لەو ساڵەدا کە ئۆپێرانووسی گەورەی ئەڵمانی ڕیچارد ڤاگنەریشی تیا لەدایك بووبوو. ئەم دوو کەسێتییە ڕەمزییەی سەدەی نۆزدەیەم دوو جەمسەری دژ بەیەکی بلیمەتیی ئەم سەدەیەن. قەرار بوو کیرکەگۆر ببێت بەوەی کە ڤاگنەر پێی گەیشت و هەروەها بە پێچەوانەشەوە. لە ڕاستیدا تاقە خاڵی هاوبەشی ئەم دوو کەسێتییە دیارە و هەروەها هی تەواوی بلیمەتەکانی ئەم سەدەیە، ڕەگێکی شێتی بوو. هەرچەندە شێتییەکەی کیرکەگۆر ڕۆڵێکی سەرەکیی لە کەسێتیی ئەودا نەدەبینی، بەڵام دەتوانین ئاسەواری ئەو شێتییە

لە هەندێ ڕەفتاری نائاسایی ئەودا لە ژیانیدا ببینینەوە. کیرکەگۆر تەواوی تەمەنی بە گۆشەگیری ژیا و چەند کاریگەرییەکی کەمی ژیان حاڵەتێکی توندڕەوانەیان تیا دروست کرد. بێگومان گرنگترین هۆکاری کاریگەر لە ژیانی کیرکەگۆردا باوکی بوو کە ئاسەواری شێتی تیایدا لە کوڕەکەی زیاتر بوو. باوکی کیرکەگۆر کاریگەریی لەسەر چۆنێتیی ژیانی کوڕەکەی هەبوو. دەتوانین بڵێین ئەو کیرکەگۆرەی کە دواتر دروست بوو، یان ئەنجامێکی ڕاستەوخۆی کاریگەریی زاڵی باوکی بوو، یانیش کاردانەوەی ئەو بەرامبەر بەو کاریگەرییە. پەیوەندییان هێند ئاسایی نەبوو. باوکی کیرکەگۆر لە لادێیەکی باکووری دانیمارکدا بە سرف (جووتیارێکی وابەستە بە خاکەوە)ی هاتبووە دونیاوە. بنەماڵەکەی دەچووەوە سەر قەشەیەکی دەرەبەگ (فیودالْ) کە لە زەوییەکانیدا کاریان دەکرد. ناولێنانی کیرکەگۆریش بۆ ئەمە دەگەڕێتەوە، کە لە زمانی دانیمارکیدا بە مانای "حەوشەی کڵێسا" (یان گۆڕستان -و-) دێ. باوکی

کیرکـــەگۆر لـــە دەســـاڵییەوە کـــاری شـــوانێتیی گـــەورەکانی بـــە خۆشـــی و ناخۆشـــیەکانیەوە لـــە ئەستۆ گرت. بە پێی قسەی یەکێك لە کوڕەکـانی، ئـــەو هەمیشـــە بەدەســـت برســـێتی و ســـەرماوە ناڵاندوویـەتی، یـانیش خـۆی و مـەڕەکانی لەبـەر تیشـکی خۆرەتـاودا لـە گـەرمادا هەڵقرچـاون و ژیـانێکی پـڕ فەلاکـەتی هـەبووە. ئـەو گەرچـی کابرایـــەك بـــوو تـــا بڵێـــی ئیمانـــدار، بـــەڵام تێنەدەگەیشــت بۆچــی خــوا وا ئــازاری ئــەدا و خســـتبوویە مەینەتییـــەکی بەردەوامـــەوە. تـــا ڕۆژێکیان و لەوپەڕی نائومێدیدا و لـە زەوییـەکی ڕەقـەن و وشـکەڵانی نزیـك گردۆڵکەیەکـدا، بـە خراپی بەرامبەر بە خوا زمانی هەڵهێنایەوە. ئیدی ڕێك لەو ساتەوە بوو کە بە تەواوی ژیانی ئاوەژوو بۆوە.

یەکێك لە خزم و خوێشەکانی کە لە کۆپنهاگن بازرگـانیی جلوبـەرگی خـوریی دەکـرد" داوای لێکـرد کـاری لەگەڵـدا بکـات. ئـەمیش سـەلیقە و توانایـەکی زۆری لـە فرۆشـتنی لێفـە و گـۆرەویی خوریـدا بـە لادێیـەکان پیشـان دا و لـە ماوەیـەکی

کەمدا پارەیەکی باشی دەستکەوت تا ژن بهێنێت و ماڵ پێکەوە بنێت.

وەختێ خاوەن کارەکەشی مرد" بازرگانییەکی بە برەوی بۆ جێما. بەمجۆرە و لە ڕێی پەرەدان بەو بازرگانییەوە کار گەیشتە ئەوەی ببێتە یەکێك لە دەوڵەمەندترین بازرگانەکانی کۆپنهاگن. ئەو شوانە برسیەی کە گلەیی لە خوا دەکرد وای لێهات لەسەر خوانی ئێوارانی پەیڕەویی لە ڕێوڕەسمی پاشایانە دەکرد. لە کاتی هێرشەکەی تۆپخانەی هێزی دەریاریی بەریتانیاشدا بۆ سەر کۆپنهاگن لە ساڵی ۱۸۰۳دا کە بووە هۆی وێرانکردنی گەلێ شوێنی گەورەی شار" هیچکام لە پێنج خانووەکەی ئەو زیانیان پێ نەگەیشت و تا دە ساڵ دوای ئەو ڕووداوەش هەریەکێك بوو لەو بازرگانە کەمانەی کە لەو قەیرانە ئابوورییەی دانیمارکی دووچاری ئیفلاسی کرد" بە سەلامەتی ڕزگاری بوو. لەبەرئەوەی زۆربەی پارەکانی لە کڕینی ئەو دراوە دەوڵەتییە کاغەزینانەدا سەرمایەگوزاری کرد کە نرخیان جێگیر و نەگۆڕ بوو.

ئەو کە ڕۆژگارێك بە خراپ زمانی لە ئاست خـــوادا هـــەڵهێنابۆوە" ســـەرباری هـــەموو ئـــەو سەرکەوتنانەی لە بواری کاریدا، هیشتا بە قووڵی هەسـتی دەکـرد کـە لـە لایـەن خـواوە نـەفرەتی لێکراوە.

ژنی یەکەمی مرد و کارەکەرەکەی خۆی هێنا، بەڵام ئەوەندەی نەبرد کە ئەویش مرد. لـە حـەوت منالْ تەنها دووانی بۆ مابووەوە.

کیرکـەگۆر کـە بچـووکترین منـاڵی بـوو، کاتـێ لەدایك بوو باوکی ٥٦ ساڵان بوو. کە منالْ بوو مەرگ هەر بەینە و کەسێکی خێزانەکەیانی ڕاپێچ دەکرد. باوکی لە کابرایەکی وەسواسی دیندارەوە دەگۆڕا بۆ پیرەمێردێکی مات و دیکتاتۆر.

ئـەوە بـوو پـاش خانەنشـینبوونی لـە کـاری بازرگانی و بە دوورەپەرێزیی لە خەڵك، لە کونجی ژوورێکی تاریکدا تەنیایی بۆ خۆی هەڵبژاردبوو. هـەر زوو توانـا درەوشـاوەکەی سـۆرین سـەرنجی ئـەوی ڕاکێشـا و بـەمجۆرە سـۆرین بـوو بـە کـوڕی خۆشەویسـتی بـاوکی. لەهـەر خێزانێکـی تـردا

بووایە ئەوە دەبووە مایەی ئێرەیی" بەڵام لە خێزانەکەی ئەواندا بارەکە بە جۆرێکی دی بوو.

کاتێ سۆرین تەمەنی حەوت ساڵان بوو" باوکی بە شێوازەکەی خۆی وانەی لۆجیك (مەنتیق)ی پێ دەوتەوە. کیرکەگۆریش ناچار بوو بە پێی بنەماکانی لۆجیك بەرگری لە گشت گوتەکانی خۆی بکات و بەردەوامیش بە پێی لۆجیك دەکەوتە بەر ڕەخنەکانی باوکی.

پشووی نێوان وانەکان بۆ سۆرین کاتی گەشتێکی خەیاڵی بوو بۆ وڵاتەکانی دیکە" بە گوێرەی ئەو زانیارییانەی کە باوکی پێی دەدا. بەمجۆرە سۆرین زۆر بە وردی گوێی بۆ باوکی شل دەکرد کە باسی کەلتوور و هونەری ساختومانسازیی شارانێکی وەکو درێسدن و پاریس و فلۆرەنسای بۆ دەکرد و، دواتریش دەبووایە هەموو ئەو شتانەی بە ورد و درشتەوە بۆ باوکی بگوتبایەتەوە.

لە ئەنجامی ئەم ئەرکە زەینییە سەختەوە بوو کە کیرکەگۆری لاو و بیرتیژ توانیی هزرێکی مەنتیقیی دیار و خەیاڵێکی بێهاوتا لەگەڵ یەکدا

ئاوێتە بکات. هەڵبەت باوکی هیچکام لەو ناوچانەی نەدیبوو کە بۆ کوڕەکەی وەسف دەکرد، بەڵکو تەنها شتی لە بارەوە خوێندبوونەوە. دواتر کیرکەگۆر ئەو توانا و خەیاڵە نائاساییەی بۆ وەسفکردنی ئەو شوێنانەی کە هەرگیز نەیدیبوون (بە تایبەتیش شوێنەکانی کتێبی پیرۆز و پێگە سایکۆلۆژییەکان) لە هەندێ کتێبدا خستەڕوو. سەرچاوەی ئەم توانایەشی دەگەڕایەوە بۆ ئەو سەفەرە خەیاڵییانەی کە بە ڕێنومایی باوکی دەیکردن.

هەندێ جاریش ڕووی دەدا کە باوکی دەیویست تێڕوانینە تەسکبینانەکانی خۆی سەبارەت بە جیهان بەسەر زەینی کوڕەکەیدا بسەپێنێت. هەرچەندە ئەمە تێڕوانینێکی باوە کە هەندێ لە باوکان دەیانەوێ مناڵەکانیان بەرەو ئەو ئامانجانە ڕێنمایی بکەن کە خۆیان پێی گەیشتوون (یان ئاساییتر بڵێین کە پێی نەگەیشتوون)" بەڵام باوکی کیرکەگۆر تەنانەت لەم ڕووەشەوە جیاواز بوو. هەستی دەکرد بەرەو

لایەك ڕاپێچ دەكرێ، بەڵام چ ئامانجێكی نەبوو، هەستی دەكرد بێزراوە و بە نائومێدییەكی تەواوەوە هۆشی مەشغوڵ دەبوو. هەمان ئەم نائومێدییەش بوو كە بە شێوەیەكی ئاگایانە یان نائاگایانە بە كوڕەكەی ئەوتەوە. لە یەكێك لە یادەوەرییە ڕۆژانەییەكانی ڕۆژانی دوایی كیركەگۆردا" بەسەرهاتی پیاوێك دەگێڕێتەوە كە ڕۆژێكیان بە كوڕەكەی خۆی وتووە" "نەگبەت، تۆ لە چ نائومێدییەكی خامۆشدا دەژیت". دەشێ ئەمە ئەو ڕستەیە بێت كە ئەو ڕۆژێ لە ڕۆژان لە باوكی خۆی بیستبێت.

جێی سەرسوڕمان نییە كە كیركەگۆر لە قوتابخانە قوتابییەكی سەیر و سەمەرە بووە. شێوەی جلوبەرگی و ڕەفتاری لەگەڵ تەمەنیدا نەگونجاوە. مامۆستاكانی ئەویان بە "پیرەمێردێكی بچووك" دەشوبهاند.

كیركەگۆر قوتابییەكی دانسقە نەبوو لە قوتابخانەكەیدا، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا تەواو دیاربوو كە لە ڕووی هوشیارییەوە لەگەڵ هاوپۆلەكانیدا جیاوازییەكی بەرچاوی هەبوو.

باوکی پێیێ گوتبوو کە نابێ کارێك بکات هۆش و توانای ببنە جێی سەرنج و نابێ لە پۆلەکەیدا لە سێیەم زیاتر بێت. هەڵبەت سۆرینی لاویش بە گوێڕایەڵییەوە ئەو فەرمانانەی بەجێ دەهێنا. (ئەم کارەش پێویستی بە کارامەییەکی زیاتر بوو، چونکە جڵەوی فراژیبوونی بلیمەتی ناگیردرێ).

وردە وردە کە تەمەنی کیرکەگۆر بەرەو هەڵکشان دەچوو" دەردەکەوت کە مەسەلەکەی ئەو لە هەبوونی شێوەو ڕوخسار و ڕەفتاری پیرەمێردێك قووڵترە. جەستەی باریك و بنێس بوو، بە ڕواڵەتیش بەدەست نەخۆشییەکی بەردەوامی بڕبڕاگەی پشتیەوە دەینالاند کە ببووە هۆی کۆمییەك لە پشتیدا. لەبەرئەوەی ئەندامی هیچ گروپ و دەستەیەکیش نەبوو لە قوتابخانە" لە لایەن قوتابییەکانەوە ئازار دەدرا. کیرکەگۆری لاو هەر زوو فێر بوو چۆن بە زمانێکی پڕ تانە و تەوسەوە بەرگری لە خۆی بکات، بەرگرییەك کە دەبووە هۆی پڕکێشیی زیاتری ئەو کەسانەی هەراسانیان دەکرد. ئەم تایبەتمەندییە

ڕەفتارییەش دەبوو لە سەرانسەری ژیانیدا خۆی بخاتەڕوو.

وەکو هەر تاکە کەسێکی دەروونگەرا و قووڵ، کیرکـەگۆر حـەزی دەکـرد لـە سـەنتەری بایـەخی کەسانی تردا بێت. هەڵبەت ئەو ببـووە سـەنتەری بایەخپێـدانی بـاوکی و، دەوڵەمەنـدیی ژیـانی دەروونیشـی سـەلمێنەری ئـەو ڕاسـتیە بـوو کـە بووەتـە سـەنتەری بایەخـدانی خۆیشـی. تانـە و تەشـەری ئـەوانی تـر" گەرچـی دەبـووە مایـەی ئازاریش بۆی" بەڵام ئەو وەهمەی لا دەجووڵاند کە لە بنەڕەتدا جیهان بە دەوری ئەودا دەخولێتـەوە. ئەم خۆ بە شەهیدزانینە بوو بە هۆکارێکی گرنگ لە بونیادی دەروونیی کیرکەگۆردا.

کیرکــەگۆر پــاش تــەواوکردنی خوێنــدنی ناوەنــدی" چــووە زانکــۆی کۆپنهــاگن بەشــی تیۆلـۆژی (خواناسـی). لـەم قۆناغـەدا" لـە ڕووی چالاکیی فێرخوازییـەوە خوێنـدکارێکی ئاسـایی بــوو" هەرچــەندە لــە کــۆڕ و کۆبوونــەوەی قوتابیەکانــــدا بــــە هـــــۆی زانیارییـــــە دەوڵەمەندەکانیـەوەو هـەروەها بـە هـۆی زمانـە

تەوسـئامێزەکەیەوە، تـەواو دەرکـەوتبوو. پـاش وەرگرتنـی لـە بەشـی خواناسـی" ئەوەنـدەی پـێ نەچـوو بـۆی دەرکـەوت کـە لـە بـری خواناسـی گرنگـی بـە فەلسـەفە دەدات. شـەیدای فەلسـەفەی هیگڵ ببوو" کە ئەودەمە وەکو پەتایـەك نـەك هـەر هـــەموو ئـــەڵمانیا بـــەڵکو ئـــەو کۆمەڵگایانەشـــی تەنیبۆوە کە کەمتر کۆمەڵگای فەلسەفی بوون. لـە ڕاسـتیدا ئـەم خەسـڵەتە قـووڵ و زۆر جیدییـەی فەلسەفەکەی هیگڵ بوو هاوشان لەگەڵ تێڕوانینە مانەوییەکـەی بـۆ تـەواوی بـوون" کـە کیرکـەگۆری سەرسام کـرد. لـە ڕوانگـەی سیسـتمە فەلسـەفییە جیهانگیرەکـــەی هیگڵـــەوە، تـــەواوی بـــوون لـــە پرۆسەیەکی دیالەکتیکیدا کامڵبوونی بە خۆیەوە دەبینـی. "تێـز"ی یەکـەم دەبـووە هـۆی هێنانـە ئاراوەی "ئەنتی تێز" و لە ئەنجامی کاردانـەوەی ئـەم دووانـەش "سـینتێز" دروسـت دەبـوو (کـە ئەمەش خۆی لە خۆیدا دەبووە "تێز"ێکی نوێ و ئیدی بەمجۆرە تا هەتایە).

نموونــە کلاســیکەکەی هیگــڵ لــەم بــوارەدا بەمجۆرە بوو:

"وجـود یـان بـوون" تێـزە، "نـەبوون" ئـەنتی تێزە و "هەبوون- یاصیرورة" سینتێزە.

لە ڕێی ئەم پرۆسە دیالەکتیکیەوە بوو کە بە بۆچـوونی هیگـڵ هــەموو شــتەکان لــە ڕەوتــی کامڵبوونیاندا بەرەو هوشیارییەکی زیاتر بە خود و دواجاریش بەرەو "ڕۆحی ڕەها" دەچوون. ئەو ڕۆحە ڕەهایەی کە لەبەرئەوەی لە خودی خۆی ڕادەکـا" هــەموو شــتەکانی لــەخۆ دەگــرت. بــە بۆچوونی هیگڵ گشت ڕواڵەتەکانی بوون بەشێکن لــەو ڕۆحــی ڕەهایــە لــە ڕەوتــی دەرکــەوتن و تەجـەللای خۆیـدا. ئـەم ڕۆحـە ڕەهـا جیهـانگیرە تەنانەت ئایینیشی دەگرتە خۆ کە بە تێڕوانینـی هیگڵ لە پلەی یەکەمی فەلسەفەی کۆتـایی (واتـە فەلســەفەکەی هیگــڵ)دا بــوو. ئــەوەی وای لــە کیرکـەگۆری دەروونگـەرا دەکـرد بـەم فەلسـەفەیە سەرسـام بێـت، بە تایبـەتی لـە لایەنـە ئۆدیپی و ئـاییـنی و خودشــەیداییەکەیدا ڕوون و ئاشــکرا بوو.

هەرچەندە کیرکـەگۆر یـەکێك بـوو لـە لایـەنگرە سەرسامەکانی هیگڵ، بەڵام هەر لـە سەرەتاشـەوە

پەیوەندیی لەگەڵیدا پەیوەندییەکی دیالەکتیکی بوو. هەر لەو پەیوەندییەیدا ڤینیشی لە هیگڵ دەبۆوە و سەرەنجامیش وایلێهات کە فەلسەفە دژە هیگڵیەکەی پڕبوو لە چەمکی هیگڵی، بە تایبەتیش لە بۆچوونیدا بۆ دیالەکتیك. بەڵام لە هەمووی گرنگتر، کیرکەگۆر لە سەرەتادا گومانی بەرامبەر بە "ڕۆحی ڕەها" و خودئاگایی (یان هوشیاری بە خود) هەبوو. بە بۆچوونی کیرکەگۆر "خودئاگایی" لەسەر ئاستی خود دێتە دی. ئەو پێی لەسەر ئەوە داگرت کە بە لای تاکەکەسەوە ئەم ئاستەی خود ئیدراکە کە زۆر لە "ڕۆحی ڕەها" گرنگترە. بە بۆچوونی هەندێ تۆژەر" لەم دژایەتیکردنەی کیرکەگۆردا بۆ چەمکی "ڕۆحی ڕەها"ی هیگڵی، دەتوانین دەنگدانەوەی زۆرانی نەستی لەگەڵ سێبەری قورسی باوکیدا بۆ سەر ژیانی ببیستین، بە تایبەتیش کە ئەو بەرامبەر بە "ڕۆحی ڕەها"ی باوکئاسا، تۆخمی خودگەرای لاو زەق دەکاتەوە.

هەر لەو ڕۆژگارەدا بوو کە پەیوەندییەکانی کیرکەگۆر لەگەڵ باوکیدا" گۆڕانی قووڵیان

بەسەردا هات. وا پێدەچێت باوکی لە کاتی
داننانی بە هەندێ شتدا لای ئەو باسی ئەوەی
کردبێت کە چۆن ڕۆژێك لە ڕۆژان لەسەر
گردۆڵکەیەك لە جوتلند قسەی بە خوا گوتووە.
دەڵێن بە ئاگابوونی کیرکەگۆر لەم مەسەلەیە
یەکێك بووە لە هۆکارەکانی دووچار بوونی بە
شەپۆلێك پەشێوی و شڵەژان و پەرێشانحاڵی و،
سەرکردنە سەر خواردنەوەی مەی لە قۆناغی
زانکۆیدا. هەندێکی تریش لەو بڕوایەدان کە
هۆکاری قووڵتر لە پشت ئەو حاڵەتانەیەوە هەیە.
دەشێ ئەو لەم قۆناغەی ژیانیدا بە دوای
بیانوویەکی بەجێدا گەڕابێت تا لە ژێر باری
سەنگینی باوکی ڕزگاری بێت. لە لایەکی
تریشەوە ئەوە دەزانین کە ئەم دانپیانانەی باوکی
بە تەنها بریتی نەبووە لە مەسەلەی قسەگوتنی بە
خوا، بەڵکو لە وانەیە باسی ئەوەشی بۆ کردبێت
کە کاتێ ژنەکەی لەسەر پێخەفی مەرگ بووە" ئەم
سەروکاری لەگەڵ کارەکەرێکی خۆیدا هەبووە کە
دواتر کیرکەگۆری لێبووە. تەنانەت لەمەش زیاتر،
بە بۆچوونی ڕۆناڵدا گریمسلی و بە گوێرەی

هەندێ ئاماژە لە یادەوەرییەکانی کیرکەگۆردا، زانیویەتی کە باوکی تووشی سیفلیس بووە، نەخۆشییەك کە دەشێ بۆ کوڕەکەشی گوازرابێتەوە.

ئەو سەرکێشییانەی کە کیرکەگۆر لە ڕێی خۆنەبەستنەوەیەکی ئاکاریدا کردنی بریتی بوون لە مەیخواردنەوە و جگەرەکێشان لەسەر شەقامەکان و تەنانەت جارێکیان بۆ سۆزانیخانەیەك دەچێت و هەر لەو یەکەم ئەزموونەیەوە یادەوەرییەکی ناخۆش لە زەینیدا تۆمار دەبێت و سەرباری هەوڵ و تەقەللاکانی بۆ خۆڕزگارکردن لە ئایین، مەسیحیەت بە پەناگەی مانەویی ئەو مایەوە.

تاقە ڕووبەڕووبوونەوەی کیرکەگۆر لەگەڵ ئەزموونی سێکسیدا لە ژیانیدا هەر ئەمە بوو کە تووشی هەڵنووتانێکی توندی کرد. لە شوێنێکدا دەنووسێت: "من بێبەریم لەو سیفاتە جەستەییە سەرەکیانەی کە بۆ ئادەمیزادێکی ساغ و ئاسایی پێویستن" لە شوێنێکی تردا باسی ئێسقانی ناو برین و ناڕێکیی لەش و ڕۆحی دەکات. بۆ زانینی

وردەکاریی ئەم مەسەلە تایبەتیانەش" کە دەشێ بێتوانایی سێکسیش بگرێتەوە، تەنها دەبێ پشت بە مەزەنە ببەستین.

هـــەموو ئـــەم تایبەتمەندێتییانـــە، ژیـــان و کارەکـانی کیرکـەگۆریان کـرد بـە "حاڵـەتێکی تایبـەتی". دەتـوانین بڵـێین کـە لەوانەیـە هـەر ئـەم بەدبەختی و ناکامییانەش بووبن بە هـۆی ئـەوەی کـە کیرکـەگۆر زیـاتر ببێـت بـە "مـرۆڤ". هـەموو ئەمانە کە وایان لەو دەکرد لـە ژیـان دوورەپـەرێز بێت، لە هەمان کاتدا، بەرەو ژیانیش پاڵیان پێوە دەنا و سەرەنجام هەر ئەم ئازار و تێکشکانانەش بـوون کـە هانیـان دا بایـەخ بـە بێهـوودەیی و هـەروەها بەلایەنـە قووڵـەکانی "دۆخـی مرۆیـی" بەرێت.

لە بەهاری ساڵی ١٨٣٦دا کیرکەگۆر تووشـی قـەیرانی نائومێـدی بـوو. هەسـتێکی سـەیر سەبارەت بە دونیـای دەروونیـی خـۆی بەسـەریدا زاڵ ببوو، وایدەبینی کە دەروونی بۆگـەن بـووە و پڕبووە لە خۆپـەرستی، تەنانەت ماوەیەك بیری لە خۆکوشتنیش دەکردەوە. لە ١٩ی مانگی ئایـاری

١٨٣٨دا بــە ئــەزموونێکی ڕۆحیــی هەژێنــەردا تێپەڕی کە لە یادەوەرییەکانیدا بە "بوومەلەرزەی گەورە" ناوی دەبات. ئەو دەنووسێت: "تـەنها بـە بیرکردنەوە لەوە ئارام دەبم کـە باوکم ئـەو ئەرکـە گرانەی لە ئەستۆ گرتبوو کە بە ئایین تەسەللامان بداتـەوە و، یارمـەتیمان بـدات لـەوە تێبگـەین کـە ئەگـەر هـەموو شـتێکیش لەدەسـت بـدەین، بـەڵام دەرگایــەك هەیــە کــە بــە جیهــانێکی باشــتردا بــە ڕووماندا بکرێتەوە". بەم شێوەیە ڕێگای گەڕانەوە بـۆ خـوا و سازشـی دەروونـی لەگـەڵ باوکیـدا بـە ڕوویدا کرابۆوە. گۆڕانێك کە لە کاتی خۆیدا هات ئەوە بوو کە سێ مانگ دوای ئەوە باوکی مرد.

بەو جۆرەی کە ئەو دەیبینی" باوکی مردبوو تـا "ئەگـەر بشـێ مـن بـۆ خـۆم بـبم بـە شـتێك". خەیاڵی بەهێزی کیرکەگۆر زۆرجار ئەفسانەی لەو ڕێکەوتانــە دەخوڵقانــد کــە تووشــی دەبــوون و کاریگەرییەکی قووڵیان لەسەری دەبوو. بەمجۆرە ئەو مانای بە ژیانی خۆی دەبەخشی.

بە مردنی باوکی پارەیەکی زۆری بە میراتی بۆ جێمـا" کـە بیسـت هـەزار کرۆنێـك دەبـوو. ئـەو

حیسابی کردبوو کە ئەم پارەیە بەشی دە تا بیست ساڵی دەکات. بەمجۆرە ئەو لە پڕێکا بوو بە یەکێك لە دەوڵەمەندترین پیاوە لاوەکانی کۆپنهاگن.

کیرکەگۆر پێنج شەش ساڵ تاقیکردنەوە کۆتاییەکانی زانکۆی دواخست. هەر لەبەرئەوەی کە باوکی حەزی دەکرد ئەم خواناسی بخوێنێت و ببێت بە قەشە، ئەو بەشەو ئەو کارەی کە ئەم حەزی پێیان نەدەکرد. بەڵام هەموو شتێك گۆڕابوو. کیرکەگۆر بە شێوازە نائاساییەکەی خۆی گەیشتبووە ئەو ئەنجامەی کە هەرچەندە لەژێر زەبری باوکیدا نەماوە و لە ڕووی داراییشەوە پێویستی بە کارکردن نییە، بەڵام ئەو لەو ڕووەوە قەرزاری باوکێتی کە دەبێ تاقیکردنەوە کۆتاییەکانی زانکۆ بدات.

کیرکەگۆر دوو ساڵی ڕێك بەوپەڕی جیدییەتەوە سەرقاڵی وانە و خوێندنەوە بوو و هاوکاتیش ڕاستگۆیانە هەوڵی دەدا وەکو مەسیحیەکی ڕاستەقینە بژی. لەو ماوەیەدا بوو کە کیژۆڵەی بنەماڵەیەکی ناوداری ناسی کە ناوی

ڕێـژین ئۆڵسـن بـوو. گەرچـی ڕێـژین دە سـاڵ لـە کیرکـەگۆر منـاڵتر بـوو، بـەڵام بـە قـووڵی عـەودالی ڕێژین بوو. خۆشەویسیتیی کیرکـەگۆر بـۆ ڕێـژین لەگـەڵ داب و نـەریتی ئـەو زەمانەیـەدا تـەبا بـوو. کتێبـی بـۆ ڕێـژین دەنـارد، هـەروەها کتێبـی بـۆ دەخوێنــدەوە و پاشــنیوەڕوانی یەکشــەممانیش قۆڵیان دەکرد بە قۆڵی یەکدا و پیاسەیان دەکرد. لە لایەکی دیکەشەوە ئەم پیاوە لاوە دەوڵەمەندە" بـــەو پایـــە کۆمەڵایەتییـــە و بـــەو ماتییـــە سەرنجڕاکێشـەی بـە دەموچـاوی و ڕەفتارییـەوە بـەدی دەکـرا" ڕێـژینی سەرسـام کردبـوو. ئـەم میهرەبانی و خۆشەویستییەی کیرکەگۆر بۆ ڕێژین زۆر قووڵ بوو" بەڵام لەسەر ئاستی ڕۆحی مایەوە. ئەم پەیوەندییەش بەلای ڕێژینەوە" بەو پاکیزەیی و بێگەردییەیـــەوە" شـــتێکی ســـەیر نـــەبوو. لەبەرئەوەی ڕەفتارێکی لـەو جـۆرە لـە کۆمـەڵگای خانـەدانانی ئـەو ڕۆژگـارەی دانیمارکـدا" شـتێکی زۆر ئاســایی بــوو و لایــەنی جەســتەییش لــە پەیوەندییەکەدا دەکەوتە قۆناغـەکانی دواتـرەوە. بەڵام ڕێـژین بـە هـەموو سـادەیی خۆیشـیەوە زوو

دەرکی بەوە کرد کە شەیدای پیاوێك بووە کەو لاوێکی ئاسایی نییە. کیرکەگۆر زۆر بە وردی ئەو کتێبانەی هەڵدەبژارد کە بە دیاری بە ڕێژینی دەدان. سەرەڕای ئەمەش سوور بوو لەسەر ئەوەی کە بە قووڵی باسی هەریەکێك لەو کتێبانەی بۆ بکات و لێکدانەوەی دروستیان بۆ بکات. پێدەچوو کیرکەگۆر بیەوێت ئەو دەسەڵاتەی باوکی بەسەر ئەمدا هەیبوو" ئەمیش بەسەر ڕێژیندا هەیبێت، هەرچەند ئەم بەو ڕەقییەی باوکی نەبوو. هیچ گومان لەوەدا نەبوو کە بە قووڵی ڕێژینی خۆشدەویست" بەڵام دەتگوت دڵی پێی دەڵێت کە خەوشێك لەم پەیوەندییەدا هەیە. جاری وابوو لە کاتی خوێندنەوەی کتێبێکدا، لە پڕێکا دەوەستا و چاوی پڕ دەبوو لە فرمێسك. یان لەو کاتانەدا کە ڕێژین پیانۆی لێدەدا. ڕێژین لە دەفتەری یادەوەرییەکانیدا نووسیبووی: "کیرکەگۆر تووشی مالیخۆلیایەکی ترسناك بووە"، ئەو حاڵەتەی کە تا دەهات زەمانە زیاتر ڕاستییە خەمهێنەکەی دەسەلماند.

دوای ئـەوەی تاقیکردنـەوەکانی‌دا“ ڕێـژین و کیرکـەگۆر بـە ڕەسمـی لـە یـەکتر مـارە کـران و کیرکەگۆر قۆناغی فێربوونی قەشەیی دەستپێکرد. ئەمانـە پایـەی "ژیـانێکی ئاسـایی" بـوون. بـەڵام کیرکـەگۆر نەیـدەتوانی ژیـانێکی ئاسـایی بـژی. خۆیشی دەیزانی کە ژیانێکی لەو جۆرە لە ڕووی دەروونـی و عـاتیفی و ڕوحـی و جەستەییشـەوە“ ئەسـتەم بـوو. کەچـی سـەرباری هـەموو ئەمانـەش ئەو "ئەستەم"ە ڕوویدابوو: ئەو عاشـق بووبـوو و ڕێژینیش لە پارێزراوێکی ڕوحی زیاتر بوو بە لای ئەوەوە. لەم کاتانەدا بوو کیرکـەگۆر هەسـتی کـرد هێزێك هەیـە بـەرەو ژیـانێکی بـاڵاتر لـە ژیـانێکی ئاسـایی دەبـات. هێشـتا نەشـیدەزانی ئـەم ژیانـە باڵاترە چییە. تەنها ئەوەندەی دەزانی کە دەیەوێ ژیانی خۆی بۆ نووسین و فەلسەفە و خوا تەرخان بکـات. ئـەو هەسـتەی هـەبوو کـە بـۆ گەیشـتن بـەو ژیانــە دەبــێ قوربــانی بــە هــەموو شــتەکانی دی بدات.

هــەر دوو ڕۆژ دوای مارەبڕینەکــەی ڕێــژین، کیرکـەگۆر گەیشـتە ئـەو ئەنجامـەی کـە هەڵـەی

کردووه. بۆیه هەوڵی دا به گونجاوترین شێوه ئەم مارەکردنه هەڵوەشێنێتەوه" بەڵام ڕێژین سەری لەو مەسەلەیه دەرنەدەچوو. سەرەنجام کیرکەگۆر ئەڵقەی مارەییەکەی بۆ ڕێژین ناردەوه" وەلێ ڕێژین هەر تێنەگەیشت مەسەله چییه. بەمجۆره بوو که ڕووداوێك له ژیانی کیرکەگۆردا ڕوویدا که بووه مایەی سەرقاڵکردنی بەردەوامی بیروهۆشی بۆ هەتاهەتایه. ساڵانێکی زۆر ڕەفتاری خۆی شیکردەوه. به خەیاڵاتەوه لێی ڕادەما، خۆی فریو دا و، به ڕاستگۆییەکی خەمگینانەوه له کاردانەوەکانی خۆی ورد دەبووه. چەند زیاتر لەوبارەیەوه داخ دەچووه دڵییەوه" بیرکردنەوەکانیشی قووڵتر دەبوونەوه. ئەوەی به ئازاری هەڵبژاردن دەستی پێکرد" سەرەنجام بوو به ناونیشانی نووسراوێکی: "ئازاری هەڵبژاردن" ئەو دووڕییانەی که هەموو مرۆڤایەتی ڕووبەڕووی دەبێتەوه. پرسیاره تایبەتیەکەی کیرکەگۆر که "دەبێ چی بکەم؟" له قاڵبی "دەبێ چۆن بژین؟"دا بوو به پرسیارێکی گشتی. کیرکەگۆر دوو سەرچاوەی ئیلهامی بۆ

فەلسەفەکەی لەبەردەستدا بوو. ئەزموونەکەی باوکی و ئەزموونەکەی ڕێژین. لە بۆتەی ئەزموونە پڕئازار و نیوروسی (عصابی) و وەسواسئاساکەی کیرکەگۆردا بوو" کە بێتواناییەکانی بوون بە خودی "دۆخی مرۆیی".

کیرکەگۆر پاش هەڵوەشاندنەوەی مارەییەکەی لەگەڵ ڕێژیندا" چوو بۆ بەرلین و ساتێك لەوێ مایەوە. لەم ماوەی مانەوەیەیدا بوو لە بەرلین کە لە وانەوتنەوەکانی فەیلەسووفی ڕۆمانتیك و ئایدیالیستی ئەڵمانی (شیلینگ)دا ئامادە دەبوو. شیلینگ لەو وانانەیدا ڕزگاربوونی هزری ئەڵمانیی لە کاریگەرییە قووڵەکانی هیگڵی" کردبووە ئاقاری خۆی. ئەو وانانەی توێژێکی فراوانی بیرمەندانی ئەودەمەی ئەوروپای بەلای خۆیدا ڕاکێشابوو. هەر لە ئەنارشیستی ڕووسی (باکۆنین)ەوە تا مێژوونووسی ئەڵمانی (بورکهارت) و هەروەها (ئینگلز)ی هاوبیر و هاوکاری نزیکی کارل مارکس. ئەم سێ هەڵکەوتووەش وەکو کیرکەگۆر دەیانویست خۆیان لە کاریگەرییە گشتگیرەکەی

بیروباوەڕەکانی هیگڵ ڕزگار بکەن (هەرچەند هەموویان لەژێر کاریگەریی زۆری ئەودا مانەوە).

بەڵام کیرکەگۆر ئاقارە فەلسەفیەکەی شیلینگی لا پەسەند نەبوو. بە ڕای ئەو شیلینگ لەو خاڵە سەرەکیە خافڵ بوو کە سیستمە فەلسەفیەکەی هیگڵ (و لە ڕاستیدا تەواوی سیستمە فەلسەفیەکان) تایبەت بوو بە ڕابردوو. سیستمێك کە لەسەر بنچینەی ئەقڵ بنیات نرابێت (کە هەموو سیستمەکان وان) بە تەنها دەتوانێ لایەنە ئەقڵانیەکانی جیهان لێکبداتەوە و بەس. کیرکەگۆر لەو ڕاستییە تێگەیشتبوو -بە تەواویش تاقیی کردبۆوە- کە خود ئەقڵانی نییە.

لە کۆتایی ساڵی ١٨٤٢دا کیرکەگۆر گەڕایەوە بۆ کۆپنهاگن و دەسنووسێکی گەورەشی لەگەڵ خۆیدا هێنایەوە کە ناوی "یان ئەم، یان ئەو، بەشێك لە ژیان" بوو. سیفەتە ژیاننامەییەکەی ئەم ناونیشانە بە زەقی دیارە. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا کیرکەگۆر ئەمەی بە ناوێکی خوازراوەوە، یان ڕاستتر وایە بڵێین بە چەند ناوێکی خوازراوەوە بڵاوکردەوە.

مەسەلەی ئەم ناوە خوازراوانەش خۆی لە خۆیدا مەسەلەیەکی ئاڵۆزە. لە سەرەتای کتێبەکەدا هاتووە کە ئەو کەسەی بە کتێبەکەدا چووەتەوە“ واتە ڤیکتۆر ئارمیتا، نوسخە دەسنووسەکەی ئەم کتێبەی لە چەکمەجەیەکی شاراوەدا دۆزیوەتەوە. ناوی بنەماڵەی ئەم کەسەش لە وشەیەکی زمانی کۆنی یۆنانیەوە وەرگیراوە کە بە مانای "تەنیا و تەرەکراو" دێ. (هەڵبەت پێویستە سەرنج لە مانای ناوە بچووکەکەش بدەین: ڤیکتۆر واتە سەرکەتوو). ئارمیتا پاش خوێندنەوەی ئەم یادەوەرییانە“ دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە دوو کەسی جیاواز نووسیویانە. یەکەمیان قازییەکە ناوی ڤیلهلم (کەسێتیی B) و دووەمیشیان هاوڕێ بێ ناونیشانەکەی قازییە (کەسێتیی A). ئەو بەشانەی کە دەگوترێ گوایە قازی ڤیلهلم نووسیونی، دوو نامە لەخۆ دەگرێت (لە شێوەی نامەی درێژدا) و لە کۆتاییشیدا ئامۆژگارییەك هەیە کە وەکو قازی ڤیلهلم دەڵێت“ قەشەیەکی نەناسراوی خەڵکی جۆتلەند نووسیویەتی. لە

بەشـەكانی تـری كتێبەكـەدا پارچـە نووسـینی بـەناوبانگی "یادەوەرییـەكانی هەڵخەڵەتێنـەرێك" دێت.

لە سەرەتای ئەم پارچە نووسینەدا، كەسێتیی A دەڵێـت كـە ئـەم نوسـینەی لـە هاوڕێیەكیـەوە دزیوە كە ناوی یۆهانزە. ڤیكتـۆر ئـەرمیتاش ئـەم قسەیەی كەسێتی A بە درۆ دەخاتـەوە و دەڵێت لەوانەیـە كەسـێتیی یۆهـانزی هەڵخەڵەتێنـەر بـوونێكی دەركیـی نـەبێت و دروسـتكراوی كەسێتیی A بێت و ئەو لافەی A لێی دەدات كە ئـەو بـە تـەنها بـا یادەوەرییەكانـدا چـووەتەوە "فێڵێكـی كـۆنی چیرۆكنووسـەكانە". لـە كۆتـایی پێشـەكیەكەدا، ڤیكتـۆر ئـەرمیتا بـە باسـكردنی ئەوەی كـە ئـەو حوكمـەی سـەرەوە دەشـێ بەسـەر پیاچوونەوەكەی ئەمیشدا بسەپێت، ئەوەندەی تر مەسەلەكە ئاڵۆز دەكات.

پێدەچێت كیركەگۆر دیسانەوە خۆی لە دۆخی دژواری ئـازاری بـێ بڕیاریـدا دیبێتـەوە. بـە شێوەیەكی سادەتر بیڵێم" هەم دەیویست لەودیو نـاوە خوازراوەكانـەوە خـۆی بشـارێتەوە و هـەم

دەیشیویست ئاشکرای بکات کە ئەم ناوانە خوازراون. ئەو نکوولّی لەوە دەکات کە "یادەوەرییەکانی هەڵخەڵەتێنەرێك" جگە لە بەسەرهاتی خۆی لە پەیوەندیدا لەگەڵ ڕێژیندا هیچی دی نییە. بەڵام لە دەقی بیرەوەرییەکاندا ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە ویستوویەتی بە شێوەیەکی نائاشکرا ئەو زانیارییانە بە ڕێژین بگەیەنێت" تا لەو عەزابەی ئاگاداری بکاتەوە کە چەشتوویەتی.

تەواوی ئەم کارە بێزارکەر و پەرشوبلاوە لە پێناوی مەبەستێکی جیدیدا نووسراوە. کیرکەگۆر وەکو بەشێك لە ئاقارە دیالەکتیکیەکەی خۆی کە لە هەموو بیروبۆچوونەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە" دەیویست کۆمەڵێك بابەت لە گۆشەنیگای جیاوازەوە بخاتە بەر حوکم و داوەری.

نەیدەویست هیچ یەکێك لەو گۆشەنیگا جیاوازانە بە ڕاست یان بەڵگەنەویست (یان تەنانەت بە دەربڕینی بۆچوونی نووسەرەکەی) لە قەڵەم بدات و، ئەوە خوێنەرە کە پێویستە بڕیار بدات لەناو ئەو ڕێگا جیاواز و هەندێ جار

دژبەیەکانـــەدا" کامیـــان هەڵبـــژێرێت. بـــەر لـــە کیرکـەگۆر، ئـەفلاتونیش بـۆ خۆپاراسـتن لـەوەی نووســــینەکانی ڕێگایـــەکی فێرگوزارییانـــەی ڕاســـتەوخۆ بگرنەبـــەر، بـــە شـــێوەی گفتوگـــۆ دەیخسـتنەڕوو. بـەڵام کیرکـەگۆر گۆشـەگیر بـوو، تەواوی گفتوگۆکانیشی لـە هۆشـی تاقەکەسـێکدا ڕوویـان دەدا، مەیـدانی فەلسـەفەکەی ئـەو بریتـی بوو لە خود.

با بـزانین کیرکـەگۆر لـە کتێبـی "یـان ئـەم یـان ئەو"دا چیی گوتـووە. لـە بنەڕەتـدا لـەم کتێبەیـدا دەڵێت کە ئێمە دەتوانین بە دوو شێواز بژین:

١-شێوازی جوانخوازانە (ئیستاتیك).

٢-شێوازی ئاکارانە (یان ئاکاری- ئەخلاقی).

هەموو کەسێك بە ئازادییەوە دەتوانـێ یـەکێك لـــەو دوو شـــێوازەی ژیـــان هەڵبـــژێرێت. سەرچاوەکانی بوونگەرایی (ئێگزیستانسیالیزم) لێرەدایە. لە پرۆسەی هەڵبژاردنی یەکێك لەم دوو شـێوازەدا" هـەر کەسـێك دەبـێ بەرپرسـیارێتیی تەواو لە ئەستۆی خۆی بگرێت. هەڵبـژاردنێك کـە بە شێوەیەکی بنەڕەتی خەسڵەتی تەواوی بـوونی

ئـــەو ديـــاری دەكـــات. كەســـانێك كـــە شـــێوازی جوانخوازی (ئيستاتيك) هەڵدەبژێرن" لە بنەڕەتدا بۆ خۆيان و ڕەزامەندیی خۆيـان دەژيـن. هەڵبـەت ئەمـەش بـە مانـای ئاقـارێكی ڕووكەشانەی ژيـان نايـــەت. ئەگـــەر لـــە ڕوانگەيـــەكی فـــراوانترەوە بيربكەينەوە" كاتێ دەمانەوێ خۆمان ڕازی بكەين" لە هەمان كاتدا دەمانەوێ ئەوانی تريش ڕازی بن. لە ڕاستيدا دەتوانين بڵێين كاتێ خوێنـدكارێك كـە تـــەواوی ژيـــانی بـــۆ دۆزينـــەوەی چارەســـەری نەخۆشـــييەك تـــەرخان كـــردووە و لـــەم ڕێيەشـــدا قوربانيی بـە هـەموو چێژە تايبـەتی و خێزانـی و كۆمەڵايەتيەكانی داوە" ئەگەر هەموو ئەمانە تەنها لـــە پێنـــاوی ئـــەوەدا بووبێـــت كـــە چـــێژ لـــە لێكۆڵينـەوەی زانسـتی ببينێـت، كەواتـە شـێوازی ئيسـتاتيكيی لـە ژيانـدا هەڵبـژاردووە. هەڵبـەت دەبـــێ ئـــەوە بڵـــێين كـــە بـــە پێـــی ڕوانينـــی دەروونناسيی نوێ و لـە كۆمـەڵگای ليبراڵـدا، زۆر زەحمەتە كەسێك بدۆزينـەوە كە لەسـەر شـێوازی ئيسـتاتيك نـەژی. ئێمـە هـەمووومان و لـە شـێوەی

سەیروســـــــەمەرەدا هــــــەڵوەدای لـــــەززەت و ڕەزامەندیین.

ناتــەبایی کیرکــەگۆر لەگــەڵ ئــەم شــێوازەدا" ئـــەدگاری ڕۆژگـــار و زێـــدی (ئەســـکەندناڤیای خۆپارێزی بەر لە فرۆید) بوو. بەڵام شیکردنەوەی بۆ مانای ئەم شێوازە تابڵێی جوان و قووڵـە. ئـەو دەیزانی چی دەڵێت. خۆی کاتێك قوتابی بوو بەم جــۆرە ژیــابوو، ئێســتاش کــە تــوخمێکی ئــەو شێوازەی تیا ماوەتەوە" هەست بە گوناه دەکات. ئەو کەسەی کە لەسەر شێوازی ئیستاتیك دەژی دەسەڵاتی بەسەر بوونی خۆیدا نییە. کەسێکی هەلپەرستە" کە تەنها دوای لەززەت و ڕەزامەندیی خـۆی کـەوتووە. دەشـێ ژیـانی بـە خـودی خـۆی نـــاکۆك بێـــت و دوور بێـــت لـــە ســـەقامگیری و یەقینـــەوە. لـە دیـدێکی وردتـرەوە، ئـەم ژیانـە هەمیشە "تاقیکارانە"یە و هەرواش دەمێنێتـەوە. لەبەرئەوەی ئێمە عەودالی لـەززەتێکی دیـاریکراو دەبین لەبەرئەوەی ئێمە بەلای خۆیدا ڕادەکێشێت.

ناکامڵی و نوقسانیی ئەم دیدگایە بنەڕەتییـە، لەبەرئـەوەی ئـەمجۆرە ژیانـە پشـت بـە جیهـانی

دەرەوە دەبەستێت. "چاوەڕێی هەموو شتەکان لە دەرەوە دەکـات" هــەر بۆیــە ئــەمجۆرە شــێوازە بــەردەوام لــەژێر کاریگەریدایــە و لــە ئــازادی بێبەرییە و پشت بە هۆکارگەلێك دەبەستێت کە دواجـار لـە دەرەوەی دەسـەڵاتی ئێمـەدان. شـتی وەکـــو دەســـەڵات، پـــارە و یـــان تەنانـــەت خۆشەویستیش، ئەمانە شتگەلێکن کە دەشێن و دێنە دەست و "کاتی"ن. شتێکی "پێویست"یان تیا نییە. ئەگەر ئێمە لەم خاڵانە تێبگەین" دەزانین کە بۆچی ژیانی ئیستاتیکی ژیانێکی نوقسانە. ئەو کەسەی بەم شێوازە دەژی" درەنگ یان زوو هەست دەکات ماناو یەقین لە ژیانیدا نامێنێت، ئەمەش دەبێتە مایەی نائومێدیی ئەو کەسە.

ئــەم نائومێدییــەش لەوانەیــە ببێتــە مایــەی دواکەوتن یان نکووڵیی لێبکرێ و یان بە ژیانێکی ڕێزدارانــەی بۆرژواییانــە بــە تــەواوی فــەرامۆش بکرێ. لە سەرێکی تریشەوە دەشێ کە ئەو کەسە هــەمان ئــەم نائومێدییــە بــە مانــای ژیــانی خــۆی دابنێت، یان دڵی خۆی خۆشبکات بەوەی کە لانی کەم یەقینێك لە ژیانیدا هەیە و ناتوانن لەو شتە

بێبەشی بکەن. هەروەکو پاڵەوانی تراژیدیاکان خۆی بە قوربانیی چارەنووسێك دەزانێت کە سروشت بۆی دیاری کردووە و لە رێی هەستکردن بە شانازییەوە ئارامی بەدەست دەهێنێت.

کیرکەگۆر هەر زوو بە هەڵەداچوونی ئەم "قەدەرخوازە فریودەرە" ڕووندەکاتەوە و دەڵێت کە ئێمە بە قبووڵکردنمان بۆئەوە خۆمان لە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ حەقیقەتێکی ژیانیدا بەدوور دەگرین. حەقیقەتێك کە بوونی ئێمەیە. ئێمە تەنانەت توانای ئازادیش ڕەت دەکەینەوە. بە قبووڵکردنی ئەوەی کە "چارەنووسمان دیاریکراوە" لە بەرپرسیارێتیی چارەنووسی خۆمان هەڵدێین. نابێ حیسابی ژیانی خۆمان بدەینە دەست کەس. دامەین بە دەست چارەنووسمانەوە. ئیدی چۆنین و چۆن دەژین نە هچیمان لێ دەگۆڕێت و تەخسیرییەکە لە ئێمەوەیە.

کیرکەگۆر لە پیشاندانی لایەنە ئارامبەخشەکانی ئەو خۆفریودانانەدا دەستێکی

باڵای هەیە. لە ڕەتکردنەوەیدا بۆ ئەو شتەی لە قۆناغی خوێندکاریدا باوەڕی پێ بوو، خۆی ئەمەی تاقی کردبووەوە.

هاوکات لەگەڵ ئەوەدا کە چین چین پەردە لەسەر ئەم خۆفریودانانە هەڵدەماڵێت" ڕێگای دەرچوونیشمان لە هەلومەرجەکانی ژیانی ئیستاتیکی پیشاندەدات. دەشێ ئێمە لەگەڵ ئەنجامگیرییەکەی کۆتاییدا نەبین (کە بە ناچاری هەر مەسیحییەتە لە بەرگێکی ڕۆحی و ڕووگرژدا)، بەڵام بەڵگەهێنانەوە هەنگاو بە هەنگاوەکانی ئەو قەناعەت پێکەرن. لەبەرئەوەی ئێمە لە چاڵی نائومێدی دەردەهێنێت و بەرەو جۆرێك لە ژیان ڕێنماییمان دەکات کە دەبێ تیایدا بەرپرسیارێتیی تەواو لە ئەستۆ بگرین.

ئەو نائومێدییەی کە کیرکەگۆر باسیدەکات دۆخێکی زۆر قووڵ و جیدییە کە لەم سەردەمەماندا برەوی سەندووە. کیرکەگۆر لە دیاریکردنی سنوورەکانی ئەم نائومێدییەدا – شێوەکانی و ئەو بەهەڵەداچوونە سایکۆلۆژییانەی کە لە پشتیەوە خۆیان حەشار

داوه– تواناى پێشبينيى خۆيمان پيشاندەدات. ڕێگەچارەشى بۆ زاڵبوون بەسەر ئەو نائومێدييەدا ڕيشەييە. بە بۆچوونى ئەو تاقە وەڵامى ڕاست بۆ ئـــەم دۆخـــــە لـــــە ئەســـــتۆگرتنى تـــــەواوى بەرپرسـياريێتيى بـوون و ژيانمانـە. ئەمـە و نـەك پەيامـــــە مەســــــيحييەكەى، پڕكاريگـــــەريترين دەســــكەوتى كيركــــەگۆرەو، ســــەدەيەك پــــاش مردنيشى گرنگيى زيـاتر دەركـەوت. لەبەرئـەوەى تاكەكەس چەند پتر باوەڕى بە خوا لە دەست دا" خۆى لەبەر هەڕەشەى دەروونناسيى جەبرگـەرا و نوقمبـــوون لـــە "كـــەلتوورى ڕەمـــەكى" و يـــان دانپيانـانى لـە لايـەن سيسـتمە تۆتاليتارەكـان و يـــانيش ونبـــوون لـــە ئاڵۆزييـــەكانى زانســـتى مۆديێرندا" بينييەوە. بە زۆرى وا ديێتە بەرچاو كە "ســـەرلەنوێ خوڵقاندنـــەوەى خـــود" لـــە ســـاى هەڵبـژاردنێكى هوشـيارانەدا" تاقـەڕێى زاڵبوونـە بەســـەر نائوميێديـــدا. كيركـــەگۆر وتـــى تاقـــەڕێى دەرچوون لەو چاڵە "بە قووڵى و بە ڕاستگۆييەوە ويستن"ە.

بەمجۆرە كیركەگۆر ئێمە بۆ شێوازەكەی تری ژیان ڕێنمایی دەكات كە بەرامبەر بە شێوازی ئیستاتیكییە، واتە: شێوازی ئاكاری (ئەخلاقی). ئەمەیان مەیدانی ڕەهای خودە و "هەڵبژاردنی خود- یان خۆهەڵبژاردن" گرنگترین ئەركێتی. كەسێك كە بە شێوازی ئاكاری دەژی لە ڕێی هەڵبژاردنەوە خودی خۆی دەخولقێنێت، ئامانجی بوونی ئەمجۆرە شێوازە خۆخولقاندنە. لە كاتێكا لە شێوازی ئیستاتیكدا، تاكە كەس خودی خۆی چۆنە هەروا قبووڵی دەكات. لە شێوازی ئاكاریدا بە هەڵبژاردنی خۆی خەریكی ناسین و گۆڕینی خودی خۆیەتی. ڕێنماشی لەم كارەدا، ناسینی خود و قبووڵنەكردنی ئەوەیە كە هەیە و تەقەللایە بۆ چاككردنی.

لێرەدا جیاوازیی بنەڕەتی لە نێوان ژیانی سەر بە شێوازی ئیستاتیك و شێوازی ئاكاریدا دەبینین. یەكەمیان گرنگی بە جیهانی دەرەوە دەدات و دووەمیشیان بە جیهانی ناوەوە. تاكەكەسی ئاكارگەرا دەیەوێ خۆی بناسێت تا بتوانێت خۆی چاك بكات. ئامانجی

بەدەستهێنانی "خودێکی ئایدیال- یا نموونەیی-"ە. هۆی ئەوەش کە بۆچی دەبێ ئەمە هەڵبژێرێت، تەواو ڕوون نییە، مەگەر ئەوەی قەناعەتمان بەوە بێت کە تاکەکەس لە ڕەوتی خۆناسیندا بە ناچاری بە ڕۆشنگەری دەگات و لەم ڕووەشەوە دەیەوێ بۆ ژیانێکی بالاتری گونجاو لەگەڵ پێودانگە ئاکارییەکاندا تێبکۆشێت.

شتێکی ئاشکرایە کە تاکەکەسی ئاکارگەرا لە ژیانی شێمانەیی و قەدەری و ناسەقامگیری و کاتی بە دوورە. ئەو "گشتێتی لە ژیانی خۆیدا پیشاندەدات" و لەم ڕەوتەشدا پێدەخاتە نێو مەیدانی کۆمەڵێك گوتەزای لە چەشنی چاکە و خراپە و ئەرکەوە. پاساوهێنانەوەکانی کیرکەگۆر سەبارەت بە چۆنێتیی گۆڕان و ڕەوتی تاکەکەسی ئاکارگەرا لەوپەڕی خودگەراییەوە بۆ ئەم "شێوە گشتییەی ژیان" بە زەحمەت قەناعەتمان پێدەکات. ئەو پشت بەو گریمانەیە دەبەستێت کە ئێمە بە شێوەیەکی خۆڕسکانە لە ناخماندا بۆ مەسەلەی ئاکاری دەوروژێین و بە مەسەلەیەکی

باڵاتری دادەنێین و بەرەو لای دەچین. هەروەکو ئاماژەشم پێدا" دەروونناسیی سەدەی بیستەم ئەوە دەخاتە ژێر گومانەوە کە مرۆڤ بە شێوەیەکی خۆڕسکی بۆ مەسەلەی ئاکاری ببزوێت. لە لایەکی تریشەوە ئەو قەناعەتەی کە ئێمە بە شێوەیەکی خۆڕسکی بە لای چاکەدا دەیشکێنینەوە" لە کۆنترین بەهەڵەداچوونەکانی ئاکارگەراکان بووە بە درێژایی مێژوو.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا کیرکەگۆر بە وردی شێوازی ئیستاتیکی و شێوازی ئاکاریمان بۆ ڕوون دەکاتەوە. یەکێکیان ئاراستەی بەرەو دەرەوەیە، قەدەر گەرایە، ناسەقامگیر و خۆوێرانکەرە. ئەوی تریشیان ئاراستەی بەرەو ناوەوەیە، پێویستە، دروستکەری کامڵبوون و خودخوڵقێنە. ئەمە قەناعەتپێکەر دێتە بەرچاو، بەڵام هەڵەیەکی تیا دەبینین. ئێمە هەرگیز ناتوانین ژیانێکی ئاکاریی پەتی هەڵبژێرین، چونکە بەردەوام تۆخمی دەرەکی و کاتی لە ژیانماندا هەیە و دەبێت. تەنانەت ئەگەر شێوازی

ئاکـاریش لـە ژیانـدا هەڵبـژێرین، بـە ناچـاری توخمێك لە شێوازی ئیستاتیکی هەردەمێنێتەوە.

ئەم ناپەتیبوونە ناچارییەی شێوازی ئاکاری" لـە هـزری کیرکـەگۆردا و لـە ڕێـی پرۆسـەیەکی دیالەکتیکیـەوە" بـە شـێوازێکی تـری سـێیەم دەگـات، کـە سـینتزی هـەردوو شـێوازەکەی پێشـووە. ئـەو ئـەم سینتزە ناودەنێـت "شێوازی ئایینی" و لە کتێبەکەی دواتریـدا واتـە "تـرس و لـەرز" کـە بـە نـاوی خـوازراوی "یۆهـانز دسـیلنتیڤ"ەوە بـڵاوی دەکاتـەوە" لـە بارەیـەوە دەدوێت.

کیرکـەگۆر لـەم کتێبـەدا لەسـەر بابـەتی بـاوەڕ "ئیمان" قسەدەکات و بە کرداری خودی کۆتـایی لە قەڵـەم دەدات، کـە نائەقڵانییـە، پرسـیارێکە لـە سـەروو هـەموو پاسـاوێکی شـیاوەوە. هـیچ پەیوەندییەکیشـی بـە ئاکـار و ڕەفتـاری باشـەوە نییـە. شـێوازی ئاکاریی ژیـان، بـەو مانایـەی کـە بریتییـە لـە هەڵبـژاردنی بەرپرسـیارانە و خۆخوڵقێنانە" ناتوانێت تەواو پیٚ بە پێی بزاوتی ئیمـان بـەرەو پێشـەوە بچـێت. ئـەم "بالابوونـە

نائەقڵانییــە" دەچــێتە ســەروو ئاکــارەوە کــە پێویستی بە ڕەفتاری ئەقڵانییە. ئیمان تاکەکەس بـە بـوونێکی بـاڵاترەوە دەبەسـتێتەوە کـە خـۆی سەرچاوەی هەموو شتێکی ئاکارییە. بە بۆچوونی کیرکەگۆر ژیانی ئاکاری لـە بنەڕەتدا بە چەمکی کۆمەڵایـەتیی ئایینـەوە پەیوەسـتە، بـەڵام چـوونە نـــاو مەیـــدانی ئایینیـــەوە" پێویســـتی بـــە "هەڵپەســـاردنی ئامانجگەرایانـــەی مەســـەلەی ئاکارییە". بە دەربڕینێکی دی بۆ کارئاسانی لـە بــە دەســتهێنانی ئامــانجێکی ڕەســەنتر (واتــە ئیمــان)دا و هــەروەها بــۆ تێپەڕانــدنی ئاکــار و وەدیهێنـانی نیـازێکی قـووڵتر" پێویسـتە پێـوەرە ئاکارییەکان هەڵپەسێرین.

بە ڕای کیرکەگۆر، دەتوانین ئایین بـە سـینتزی دیالـەکتیکیی ئیسـتاتیك و ئاکـار بـزانین. ئـایین ناوەوە و دەرەوە و یەقین و نایەقین لەخۆ دەگرێت (بزاوتی ئیمان لە سەروو هـەموو یەقینێکەوەیـە). کیرکەگۆر هەوڵدەدات لە ڕێـی چیرۆکی حـەزرەتی ئیبراهیم و حەزرەتی ئیسحاقەوە حاڵـەتی ئـایینی ڕوون بکاتـەوە. بـە پێـی تـەورات" خواوەنـد بـۆ

تاقیکردنەوەی ئیمانی ئیبراهیم" فەرمانی دەداتێ ئیسحاقی کوڕی بکات بە قوربانی (لە قورئاندا حەزرەتی ئیسماعیلە نەك ئیسحاق-و-). ئاشکرایە کە ئەم کارە کارێکی نائاکارییە، بەڵام ئیمانی ڕاستەقینە (کە پێویستە لە قۆناغی ئایینیدا هەبێت) نیازە خوداییەکان لە خۆ دەگرێت کە تەواوی پێودانگە ئاکارییەکان دەگرێتەوە.

ئیبراهیم بەبێ هیچ دوودڵییەك سەبارەت بەم کارە" گوێڕایەڵیی فەرمانەکەی خواوەند دەکات. لێرەدا ئەو لەسەر ئاستی ئایینی دەژی، کە لە ئاستی ئاکاری بالاترە، لەبەرئەوەی ئیمانی بە خواوەندێتییە کە سەرچاوەی ئاکارە. لەوانەیە زۆر کەس ئەمە بە شێتییەکی خەتەرناك بزانن. هەڵبەت دیندارە توندڕەوەکان بە درێژایی مێژوو لەمجۆرە ڕەفتارەیان کردووە، وەك چۆن ستەمکارەکانیش کردوویانە. بەلام کلیلی مەسەلەکە لە دەروونناسیدایە. تاقە بەرگریی ڕاستەقینە کە کیرکەگۆر بتوانێ لە خۆی بکات

ئەوەیــە کــە ئــەوەی مەبەســتێتی" دیــالۆگێکی ڕوحییە" نەك كارێکی کۆمەڵایەتی.

ئەگەر وەکو دوو توخمی جیاوازی کەسێتییەك بڕوانینە حەزرەتی ئیبراهیم و حەزرەتی ئیسحاق" لەوانەیە مەسەلەکەمان لا ڕوونتر بێت و هـەروەها زیـاتریش ببێتــە مایــەی قەناعــەتکردنمان. بــۆ گەیشتن بە هەر ئامانجێك قوربانیدان (فیـداکاری) پێویستە. عادەتەن ئەم قوربانیدانەش نائەقڵانییە و دەشێ لەگەڵ دەرككردنی پێشوەختی ئێمەشدا بۆ ڕاستی و چەوتی یەك نەگرێتەوە. لـە دیـدێکی دەروونییــەوە" زۆرجـار ئێمـە لـە ڕێـی بزاوتێکـی نامــەعقولی ئیمانــەوە مەبەســتەکانی ناوژیانمــان دەبینینـــەوە، کــە پەیوەندییــەکی ئــەوتۆی بــە ئاکــارەوە نییــە. کیرکــەگۆر ئەمــە بــە ئایینـــەوە دەبەستێتەوە. بەڵام ئەمە شتێك نییە لەسەر ئایین پاوان بێت، بەڵکو سەبارەت بە هەر کەسێك ڕاستە کــە ئامانجێــك بــە ژیــانی خــۆی دەدات. لـــە هونەرمەندێکــەوە بیگــرە تــا سیاســەتمەدارێك. هەروەکو کیرکەگۆریش وتویەتی: "ژیانی شاعیر

له ناكۆك بوونیەوه لەگەڵ تەواوی بووندا دەست پێدەكات".

لێدوانی كیركەگۆر لەسەر چیرۆكی ئیبراهیم و ئیسحاق درێژه دەكێشێت. پەیبردن بە هۆی ئەمەش شتێكی دژوار نییە. دیسانەوه دەنگدانەوەی پچڕانی پەیوەندی لەگەڵ ڕێژینندا دەبیستین. هەروەكو بینیمان لەوانه بوو كارێكی وا لە ڕووی ئاكارییەوه نادروست بكەوێتەوه" بەڵام كیركەگۆر بۆ بەدواداچوونی ژیانێكی ئایینی ئەوەی بە پێویست زانی، بە هەمان شێوه بیستنی دەنگدانەوەی پەیوەندیی لەگەڵ باوكیشیدا دەبینینەوه.، لە دوا چركەساتدا خواوەند دەستی ئیبراهیمی گرت و نەیهێشت ئیسحاق بكرێ بە قوربانی. باوكێكی دەسەڵاتخوازیش كیركەگۆری تا سەر هەڵدێری كەوتنێكی ڕوحی برد، بەڵام پاشان مرد تا "ئەو ئەگەر بتوانێت ببێت بە شتێك".

تا سی ساڵی" كیركەگۆر ژیانی خۆی بۆ نووسین تەرخان كرد. دوای ئەوەی هاوڕێكانی زانكۆی لە دەوری نەمابوون و ئەو لە تەنیاییەكی

ڕەهادا دەژیا. تەنها بۆ پیاسەی دوور و درێژ لە ماڵــەوە دەچــووە دەرەوە. لــە شــەقامەکانی کۆپنهاگنــدا" بــە سەروســیمایەکی باریــك و چــەماوەوە و پــانتۆڵێکی دەرلــنگ تەســکەوە دەردەکـەوت، کـە بـەردەوام دەرلنگێکیـان لـەوی تریان کورتتر بوو و هەمیشەش پیرتـر لـە تەمـەنی خۆی دەهاتـە بەرچاو. لـەم پیاسانەیدا جار جار دەوەســتا و لەگـــەڵ منالآنــدا دەدوا و هەنــدێ جـاریش دیـاریی بچـووکی دەدانــێ. ڕەنگـە ئـەو منالآنــەش بــە سوپاســێکی تێکــەڵ بــە تــرس و زۆرزانیەکەوە ئەو دیارییانەیان لەم پیرەمێردە لاوە سەیر و سەمەرەیە وەرگرتبێت.

لە کۆتایی هەفتەکانـدا گالیسکەیەکی بەکرێ دەگــــرت و بــــەناو بــــاخ و باخــــاتی شــــار و دەوروپشتیدا دەگەڕا. چاوەڕێی ئەوەی دەکرد کە خــەڵك بــە جــوانی ڕەفتــار لەگــەڵ کــوڕی دەوڵەمەنــدترین بازرگــانی کۆپنهاگنــدا بکــەن. گەرچی بنەماڵەکەی ئۆڵسن لەسەر ڕەفتاری لەگەڵ ڕێژینــدا بــە تونـدی لــەو زویــر بووبــوون و لــە کۆمەڵگای سەنگینی خۆیان دەریانکردبوو.

ڕۆژانــی یەکشــەممە دەچــوو بــۆ کڵێســا و پێدەچــێ زۆربــەی جارەکــان لــەوێ ڕێــژینی بینیبێت. گەرچی لەگەڵ یەکدا قسەیان نەدەکرد" بـەڵام هەسـتیان بـە ئامـادەبوونی یـەکتر دەکـرد. وێڕای ئەوەی کەزۆر ئازاری ڕێـژینی دابوو (هـی خۆیشـی زیـاتر) بـەڵام دەتـوت هێشـتا عیشـقێکی نهێنییان لە بەیندا ماوە. سەرباری خودشیکاری و ڕاستگۆیی دەروونی" بەڵام بە شێوەیەکی خراپ ئامادە بوو خۆی فریوبدات.

نەیدەتوانی لەوە نائومێد بێت کە ڕۆژێك دێ بـە جـۆرێ لـە جـۆران دووبـارە لەگـەڵ ڕێژینـدا پەیوەندی دەبەستێتەوە، پەیوەندییـەکی ڕوحـی. هەرچـــەندە دەیزانـــی کـــە ئەمـــە ئەســـتەمە. شیکردنەوەی ئەم پەیوەندییە بووە هۆی بەردەوام مەشـــغوڵکردنی زەینـــی کیرکـــەگۆر و زیـــاتر وردبوونـەوەی لـە خـودی خـۆی. ئـەو شـتەی کـە ڕۆژێك لە ڕۆژان بووبوو بە مایەی ڕیسوایی ئەو بە هـۆی نوقسـانیی شەخسـیەوە، وای لێکـرد بــە قووڵی پەی بە ڕەهەنـدە جیاوازەکانی نوقسانیی سروشـتیی مرۆیـی بـەرێت. خودگـەرایی خـۆی

شتێکی مەحاڵ بوو" بەڵام دەبووایە ژیانی بە بەردا بکرایە.

لەم بارودۆخەدا لەسەر نووسین بەردەوام بوو. لە ساڵانی ١٨٤٤ تا ١٨٤٦ پێنج شەش کتێبی بە ناوی خوازراوەوە بڵاوکردەوە. ناوی وەکو یۆهانز کلیماکۆس ("ژان"ی بەرزەفڕ)، ڤیرژیلیۆس هوفنینسیس (چاودێری گردی پاشماوە)، هیلاریۆس بوم بایندەر (بەرگتێگری خۆشحاڵ) و فراتر تاسی ترنۆس (برای کەمدوو). ئێستا، هەروەکو خۆیشی بەو ئومێدە بوو" تێگەیشتووەکانی کۆپنهاگن خەریکبوون وردە وردە دەرکیان بە ناسنامەی ڕاستەقینەی ئەم بەرزەفڕە خۆشحاڵ و کەمدووەی گردی پاشماوەکان دەکرد.

بیروڕاکانی کیرکەگۆر بە خێراییەك کە لە خێرایی بەرهەمی قەڵەمەکەی دەکرد" گەشەی دەسەند. شیکردنەوەکانی ئەو بۆ "بوون" بوو بە تەوەری سەرەکیی ڕێبازی بوونگەرایی" کە دواتر لە مەیدانی فەلسەفەدا سەری هەڵدا. بە تێڕوانینی کیرکەگۆر "بوون" لە ژمارەیەکی ئاڵۆز دەچوو.

پاش شیکردنەوە و وەلاخستنی هەموو شتەکان“ ئەوەی دەمایەوە هەر بوون بوو. بە تەنها بوون "بوون". کیرکەگۆر لە ڕووی گاڵتەوە بوونی بە بۆقێك دەشوبهاند کە دوای خواردنەوەی شەربەتێك لە بنی پەرداخەکەدا دەردەکەوت.

بەڵام وەختێ ئێمە لە بوونی خۆمان دەکۆڵینەوە“ دەبینین شتێکە زیاتر لە "بوو". دەبێ ژیان بە بەری "وجود"دا بکرێ، دەبێ لە ڕێی "بیرکردنەوەی خود"ەوە بکرێ بە کردەوە. ئەمە توخمی سەرەکیی خودگەرایی ئێمەیە و هەر ئەمەشە کە بەرەو حەقیقەتی خودمان دەبات. لێرەدایە کە دەتوانین لەو مەبەستەی کیرکەگۆر تێبگەین کە دەڵێت "خودگەرایی حەقیقەتە".

بە بۆچوونی کیرکەگۆر دوو جۆر حەقیقەت شك ئەبەین:

حەقیقەتی بابەتی، وەکو حەقیقەتە مێژوویی و حەقیقەتە زانستیەکان کە بە جیهانی دەرەوە پەیوەستن. دەکرێ ئەمانە بە پێوەرە دەرەکیەکان بسەلمێنرێن، بە واتایەکی دی“ حەقیقەتی بابەتی وابەستەیە بە "ئەو شتەی کە گوتراوە"، لە کاتێکا

کە حەقیقەتی خودی وابەستەیە بەوەوەی کە "چۆن گوتراوە".

بە پێچەوانەی حەقیقەتی بابەتییەوە" بۆ هەڵسەنگاندنی حەقیقەتی خودی هیچ پێوەرێك لە دەرەوەی هۆشدا نییە. کیرکەگۆر لێرەدا نموونەی دوو کەس دەهێنێتەوە لە کاتی نزاکردندا. یەکەمیان نزا بۆ "خواوەندی ڕاستەقینە" دەکات (کە لە ڕوانگەی کیرکەگۆرەوە خوای مەسیحیەتە)، بەڵام لە نزاکردنەکەیدا ڕاستگۆ نییە، کەسی دووەم موشریکێکە کە نزا بۆ بتە سەرەتاییەکەی خۆی دەکات" بەڵام بە ڕاستگۆییەوە دڵی لای حەقیقەتی هەتاهەتاییە، بە بۆچوونی کیرکەگۆر نزاکردنی ئەم کەسەی دووەم زیاتر حەقیقەتی خودیی تێدایە. چەمکی حەقیقەتی خودی لای کیرکەگۆر لە چەمکی ڕاستگۆییەوە نزیکە و ئیلتیزامێکی دەروونیی ئاوێتە بە شەوق و تامەزرۆیی لەخۆ دەگرێت.

حەقیقەتە خودییەکان لەو ڕووەوە بایەخیان زیاترە کە بە ئەسڵی "بوون"ی ئێمەوە پەیوەستن. هەروەکو بینیمان بە هیچ پێوەرێکی دەرەکییەوە

وابەستە نین و ئەو "شتە ئاڵۆزە"ن کە وەختێ تەواوی حەقیقەتە بابەتیەکان گوزەر دەکەن" ئەم دەمێنێتەوە. کەواتە حەقیقەتی خودی بە بونیادی بەهاکانی ئێمەوە وابەستەیە –نەك ئەوەش کە تا چەند لەگەڵ ئەو بەهایانەدا ڕاست دێتەوە یا نایەتەوە" بەڵکو تا چەند لەگەڵ سروشتی ئیلتیزامی ئێمەدا بەو بەهایانەوە یەك دێتەوە.

لەم ڕوانگەیەوە هیچ ئاکارێك لە ڕاستیەکانی بابەتەوە سەرچاوە ناگرێت. ئەوەی جێی سەرنجە ئەوەیە کە لێرەدا کیرکەگۆر لەگەڵ فەیلەسووفی بە گومان و بێباوەڕی سکۆتلەندی "داڤید هیوم"دا یەکدەگرێتەوە کە لە سەدەی هەژدەیەمدا دەژیا. هیوم بڕوای وابوو کە تاقە ڕێی بەدەستهێنانی زانست تاقیکردنەوەیە و هەر لەم ڕێگایەشەوەیە کە ئەو شتانە بەدەست دەهێنین کە ناویان دەنێین ڕاستیەکان. بەڵام هیچ جۆرە ئاکارێك لەم ڕاستیانەوە بەدەست نایەت. بۆ نموونە ناتوانین لەو ڕاستیەوەی کە لە سایەی دوورکەوتنەوە لە ئەلکهولەوە ئەقڵمان سەلامەت دەبێت" بگەینە ئەو حوکمەی کە ئیدی پێویستە واز لە ئەلکهول

بهێـنین. هـەم کیرکـەگۆر و هـەم هیـوم ڕێـك بـوون لەسـەر ئـەوەی کـە نـاتوانین لـە "وایـە"وە بگەینـە "دەبێ". (هەوڵدان لە پێناوی گونجاندنی ئاکار لە فەلسـەفەدا بـە "بـە هەڵەداچـوونی ناتورالیسـتی" ناسراوە).

باوەڕهێنـــانی کیرکـــەگۆر بـــە بـــاڵاتربوونی حەقیقەتی خود بـووە هـۆی ئـەوەی کـە گومـان لـە بۆچوونی هیوم سەبارەت بە "ڕاستیەکان" بکات. کیرکەگۆر بە باشـی لـەوە گەیشـتبوو کـە تەنانـەت ئـەوەی پێـی دەڵـێن "ڕاسـتیەکان" لـە هەڵوێسـتی (خودیی) خۆمانەوە سەرچاوە دەگرن.

بـە پێودانگێـك کـە جێـی بایەخپێدانـە" ئـەوە بەهاکانی ئێمەیە کـە "ڕاسـتیەکان" دیاریـدەکات. بـۆ نموونـە لـە ڕووبەڕووبوونـەوەدا بەرامبـەر بـە هەڵوێستێك" کەسێکی دیندار و کەسێکی بێ دین ڕاستیی جیاوازی تیادەبیننەوە. لەم ڕووەوە هـەر کەســە و بــە پێــوەری خــۆی جیهــانی خــۆی دەخولقێنێـت و بـە گـوێرەی ئـەو بەهایانـەی کـە پـەیڕەوییان لێـدەکات جیهـانی خـۆی دروسـت دەکات.

دەتــوانین لــەم تێڕوانینــەی کیرکــەگۆردا سەرچاوەکانی ڕێژەگەرایی (نسبیەت)ی ئەمڕۆ ببینینــەوە کــە نکــووڵی لــە هــەموو جــۆرە حەقیقەتێکی بابەتی دەکات. تەنانەت کیرکەگۆر بانگەشــەدەری ســەرهەڵدانی دیاردەناســی (فینۆمینۆلۆژیا)ی سەدەی بیستەمیشە" وەختێ تەواوی شێوەکانی خودئاگایی (یان هوشیاری بە خود) بە "بایەخپێدەر" دەزانێت و دەشڵێت کە هەمیشە هوشیاری مەبەستدارە. ئێمە جیهان بەو جــۆرە دەبیــنین کــە مەبەســتمانە. هــەروەکو ڤیتگنشتاین دەڵێت کەسی بەختەوەر و کەسی بەدبەخت لە دوو جیهانی جیاوازدا دەژین. ئەم بۆچــوونە بــە ڕواڵــەت بەڵگەنەویســتە" وەختــێ زانیمان کە ئەو سەبارەت بە بەکارهێنانی ئیرادە دەدوێت" زیاتر لامان قووڵ دەبێتەوە. هەروەکو کیرکەگۆریش وتویەتی هەرکەسێك دونیا وەها دەبینێت کە ویستوویەتی بیبینێت. ئەمەش پەیوەندیی بەو بەهایانەوە هەیە کە ئەو کەسە پێشــتر هەڵیبــژاردوون و لەگەڵیانــدا دەژی و خۆیشی لە ڕێی ئەو بەهایانەوە دروست بووە.

بەمجۆرە کیرکەگۆر دەگەیشتە ئەو ئەنجامەی کە ئـەو بەهایانـەی تاکـە کـەس دروسـت دەکـەن" جیهانیش دروست دەکەن.

دەشێ تێڕوانینێکی فینۆمینۆلۆژییانەی وەها لـە ڕوانگـەی زانایەکـەوە کـە بـاوەڕی بـە زانسـتە تێڕوانینێکی ڕاست بێت، زانایەك کە جیهانەکەی بۆ نموونە لە جیهانی مێژوونووسێك جیاوازە کـە بـاوەڕی بـە مێـژوو هەیـە، بـەڵام دەبـێ ئەنجامـە خراپـەکانی ئـەم تێڕوانینـەشمان لەبەرچاو بێـت. مەترسـیی سـەرەکیی بـاوەڕی خـودییش لـەم تێڕوانینەوە سەرچاوە دەگرێ. واتە ئەوەی کە بە تەنها من هەم و ئەم جیهانەش لەبەر من هەیە. یان هـەروەکو چـۆن کیرکـەگۆریش دەیـوت مـن بـە تەنیاییـــەوە بەرپرســـی جیهـــانی خـــۆمم. فەیلەسووفی بوونگەرا ژان پۆڵ سارتەر لە سەدەی بیستەمدا" ئەم تێڕوانینەی گەیانـدە دوا سـنوورە مەنتیقیـەکانی. کاتـێ لـە سـاڵی ١٩٤٠دا کـە لـە سوپای فەرەنسادا خزمەتی دەکرد" گەیشـتە ئـەو باوەڕەی کە دەبێ ئەوەی قبووڵ بێت کە بە تـەنیا لـەو جەنگـە جیهانییـە بەرپرسـیارە. ئـەم جـۆرە

خودگەراییە پەتییە دەشێ مۆرکێکی ئەخلاقی بەخۆوە بگرێت" بەلام زەحمەتە ببێت بە جیهانبینییەکی سوودمەند.

هەر ئەم مۆرکە ئەخلاقیەش بوو کە کیرکەگۆر بە دوایدا دەگەڕا. ئامانجی ئەو ئەوە بوو کە لە جیددیترین و چڕترین شێوەیدا گوتەزای بوون بخاتەڕوو. تەنها بەمجۆرە دەتوانین بوون وەکو خۆی ببینین و بزانین بوون بۆچی هەیە و دەکرێ ببێت بە چی. "بوون" خەتەربازییەکی گەورەیە. ئێمە هەرگیز ناتوانین لەوە دڵنیابین کە ئەو شێوازەی بۆ ژیانمان هەڵمانبژاردووە شێوازێکی ڕاستە. بە بۆچوونی کیرکەگۆر هەرکەسێك بە تەواوی ئەمە تێبگات بایەخێکی بەردەوامی پێ بدات و بە ناچاری دووچاری دڕدۆنگی دەبێت. ئەم حەقیقەتە خودییانە کە ناتوانین هیچ بەڵگەیەکی بابەتیانەیان بۆ بهێنینەوە، لەسەر کۆڵەکەی هیچ بەندن. بەمجۆرە پەی بە هیچبوونی وجود و ئەو نایەقینەش دەبەین کە لە ناوجەرگەیدایە. ژیان لە بنەڕەتدا مەسەلەیەکی

مەزەنـەیی (حدسـی) و ئـەزموونی و جیوەئاسـایە (واتە ناگیریّ-و-).

تەنانـەت هوشـیاری خۆیشـی مەسـەلەیەکی ناودژ (متناقض)ە کە لەسەر بەریەککەوتنی کردە و توانسـت (ئیمکـان) و خـاڵی بەریەککـەوتنی ئەوەی هەیە و ئـەوەی نییە وەستاوە. (هـەروەکو کیرکـەگۆریش گوتویـەتی: "ژیـان بـە ئاراسـتەی دواوە دەرك دەکریّ، بەڵام بە ئاراستەی پیّشـەوە ئەنجام دەدریّ"). بەمجۆرە هوشیاری خوڵقیّنەری ناودژیّتییـــەکی دەروونییـــە و مەســـەلەیەکی دوولایەنەیە. هوشیاری بە خود خۆی جۆریّکە لە گومـان. ئـەم ڕوانینـە تەنانـەت لـە ئاقارەکـەی دیکـارتیش زیاتر دەڕوات کە گومانی لـە هـەموو شـتیّك دەکـرد. لەبەرئـەوەی دیکـارت سـەرەنجام گەیشتە ئەو قەناعەتەی کە هـیچ گومـانیّکی لـەوە نییە کە بیردەکاتەوە. لە کاتیّکا کیرکەگۆر ئـەوەی پیشـــان دا کـــە هوشـــیاری یـــان بیرکردنـــەوەی هوشیارانە نەك هەر شتیّکی گومان لیّنەکراو نییە“ بـەڵکو خـۆی شـیّوەیەکە لـە گومـان، چـونکە لـە

هوشیاریدایه که ئێمه گومان لـه خـودی "وجـود" دەکەین.

بەڵام ئایا لە ڕاستیدا ئەمـە دەورێکـی یـەك بـە دوایەکدا گرێدراو نییە؟ بەمجۆرە تێڕوانینە ئێمـە دەکەوینــە نــاو ناســەقامگیرییەکەوە کــە ئــەو چـەمکانەی لـە بەردەمیشـماندا دەبـن بێهێـز دێنـە بەرچاو و جێی متمانە نابن. گریمان هوشیاری بە خودیش جێـی گومانـە، ئایـا دەتـوانین تەسـەوری ئـەوە بکـەین شـتێك کـە لـە بنەڕەتـدا بـوونی نییـە توانای ئەنجامدانی شتی هەیە؟ بۆ نموونە گومان بکات؟ ئەوانەی بەرگری لە کیرکەگۆر دەکەن دەڵێن کـە ئـەو ناڵێـت هوشـیاری بـە خـود بـوونی نییـە“ بـەڵکو بـە تـەنها گومـان لـە بـوونی دەکـات. ئەمـە خــاڵێکی زۆر زینــدووە. بــە واتایــەکی دی ئــەو دەڵێــت کــە "دەتــوانین گومانمــان ســەبارەت بــە هوشـیاری بـە خـود هـەبێت". بـۆ جـارێکی دی کیرکەگۆر بە گەیشتنی بەو گومانداریێتییەی هیوم بۆی دەرکەوت کە دەتوانێت گومان لە بەردەوامیی هوشــیاری بکــات. ئێمــە ئــەم بــەردەوامبوونی هوشیارییە لە چرکەساتێکەوە بۆ چرکەساتێکی

دیکــە تــاقی ناکەینــەوە. ئــەوەی ئێمــە تــاقیی دەکەینەوە چ نییە جگە لە چرکەساتی هەنووکە. بــەمجۆرە هوشــیاری بــە تــەواوی دەبێتــە جێــی گومان. هەر ئەوەندەش کە سەرنجی ئەم خاڵەمان دا" ئیدی "بوون" لە جاران خەتەرناکتر دەبێت.

کاتێکیش بۆمان دەردەکەوێ کە دەشێ لەهەر ساتێکدا بمرین، ئـەم مانایـەمان زیـاتر لا ئاشـکرا دەبێت. (ئێمە لە ڕێی ئەزموونی "مردنـی ئـەوانی دی" و هــەروەها لــە ڕێــی زانیــاریی خۆمانــەوە ســــەبارەت بــــە بەردەوامنــــەبوونی هوشــــیاری" حەقیقــەتی مــەرگمان بــۆ دەردەکــەوێ). هاوکــات دەبێ تەواو لەو ئازادییە تەواوەتییە بەئاگا بین کە لە هەر ساتێکدا هەمانە" واتە ئەوەی کە دەتوانین چیمان بوێـت هەڵیبـژێرین، دەتـوانین بـە تـەواوی ژیانمــان بگــۆڕین. ئێمــە لــە هــەموو ســاتێکدا ڕووبەڕووی ئـەم ئازادییـە تەواوەتییـە دەبینـەوە. ئەمــە دۆخــی ڕاســتەقینەی بەردەممانــە. لــە ئەنجامیشدا ئەگەر ئێمە تەواو لەم دۆخـە بـە ئاگـا بین دوچاری "ترس" دەبین.

کیرکـەگۆر کتێبێکـی تـەواوی سـەبارەت بـە "چەمکی ترس" نووسیی. ئەم گوتەزایە کە وشە ئەسڵیە ئەڵمانییەکـەی "Angst"ە بە نیگـەرانی و دڕدۆنگیش تەرجەمە کراوە.

کتێبی "چەمکی تـرس" یەکێکە لـە قووڵترین کتێبـە سـایکۆلۆژییەکانی بـەر لـە فرۆیـد. لـەم کتێبـەدا کیرکـەگۆر دوو جـۆر ترسمـان بـۆ شـی دەکاتـەوە. جـۆری یەکـەمیان ترسـێکە کـە لـە ئەنجامی ڕووبەڕووبوونەوەمانەوە لەگەڵ دۆخێکی ترسناکی جیهانی دەرەوەدا دروست دەبێت، بەڵام جۆری دووەم ترسێکە کە لە ئەزموونێکی ناوەوە سـەرهەڵدەدات. کاتـێ کـە ڕووبـەڕووی توانـا بێسـنوورەکانی ئازادیمـان دەبینـەوە و پـەی بـە گـەورەیی و فراوانـی و نائـەقڵانیبوونی دەبـەین. (هـەروەکو کیرکـەگۆریش ڕوونـی دەکاتـەوە سـەلماندنی ئـەو مانایـەکی کـە ئێمـە لـە ئـازادی بەهرەمەنـدین نەشـیاوە“ لەبەرئـەوەی بـۆ سەلماندنی ئەمە پێویست بە زەرورەتی لـۆجیکی دەکات کە دژ بە ئازادییە).

ئـازادی هـیچ پەیوەندییـەکی بـە فەلسـەفەوە نییە. بابەتێکی سایکۆلۆژییە و وابەستەیە بە دۆخ و حاڵەتی هوشیاریمانەوە. حاڵەتی هوشـیاریمان پاسـاوەدەری ئازادیمانـە (نـەك ئەنجامگیرییـە مەنتیقیە- فەلسەفییەکان). ئێمە بە تـەنها کاتێك لە ڕەهەندە تەواوەتیەکانی ئازادیمان دەگەین" کە ئەو حاڵەتە هوشیارییە تایبەتیەی کە پێی دەڵـێن "ترس" تاقی بکەینەوە. لـەم ڕوانگەیەشـەوە هـەر تاکـە کەسـێك نـەك "بـوون" (وجـود)ێـك" بـەڵکو "هـەبوون" (صـیرورة)ێکـی بەردەوامـە کـە بـوونی هەیـە. ئـەو ترسـەی لەمـەوە سەرچـاوە دەگـرێ شتێکی سروشتییە، بەڵام تێگەیشتنی تەواوی بە شـێتی دەشـکێتەوە. بـە بۆچـوونی کیرکـەگۆر تاقـەڕێی خۆپاراسـتن لـەم شـێتێتیی ترسـە" بزاوتێکـی نائەقڵانییـە بـەرەو ئیمـان. بـەمجۆرە تاکەکەس بە هۆی پەیوەستبوونی دەروونییانەی خودییـەوە بـە خـواوە" لـە شـێتی و پەرتـەوازەیی دەروونی ڕزگاری دەبێت.

بەڵام پرسیارەکە لەوەدایە کە ئایا هەر تەنها بە ئاگابوونی پەتی لە ئازادی بۆ بزواندنی هەستێکی

بەهێزی ترسی لەمجۆرە بەسە؟ هەروەها ئایا بە تەنها ئەمە هونەرێکە تایبەت بە بلیمەتانێکی وەکو کیرکەگۆر و کافکا کە لە حاڵەتی ترسی سەرچاوەگرتوو لە هوشیارییەوە دەتوانن سوود لە توانا فراوانەکانی بوونیان وەربگرن؟ دەشێ وابێت. بەڵام ئێمەش کە خەڵکی مامناوەندین، زۆربەشمان ساغ و ئاسایین" دەتوانین هەست بەم ترسە بکەین. کاتێك بەسەر توولەڕێیەکی سەر هەڵدێرێکدا دەپەڕینەوە" هەست بە ترسی کەوتن و گێژبوون دەکەین. بەشێکی ئەم ترسە لەم دۆخەدا لە ئەنگێزەیەکی سەیرەوە سەرچاوە دەگرێ کە لە هەمان کاتدا کە بەلای ئەو قەراغی هەڵدێرەدا دەمانبات" ئێمە دوور دەخاتەوە لێی. بە بۆچوونی کیرکەگۆر ئەو ترس و نیگەرانییەی سەرەوە لەوەوە سەرچاوە دەگرێ کە ئێمە دەزانین کە دەتوانین بە ئاسانی خۆمان فڕێ بدەینە خوارەوە و هەر ئەم ئازادی و هەڵبژاردنەشە دەبێتە هۆی دروستکردنی ئەو ترس و نیگەرانییە لامان. ئێمەش ئەو ترسە تاقی دەکەینەوە. ئەم

شـــێتی و ترســـە لـــەژێر حاڵـــەتێکی ئاســـایی سروشتیدا خۆی حەشار داوە.

لە ساڵی ١٨٤٤دا کیرکـەگۆر کتێبـی "چـەمکی ترس" و هەروەها کتێبێکی تـری چڕ و پوختـەی بە ناوی "بڕگە فەلسەفیەکان"وە تەواو کـرد. ئـەم کتێبـە کورتکراوەیـەی دواییـان لـە کۆتاییەکەیـدا پاشبەندێکی زۆر گەورە و فراوانی لەخۆ گرت کە شەش سەد لاپەڕە بوو و بەناونیشانێکی درێژەوە کـە ئەمـە بـوو "پاشـبەندێکی نازانسـتیی بڕگـە فەلسـەفیەکان- کۆکردنەوەیـەکی تەقلیدییانـە- بـەزەیی بزوێنانـە- دیالەکتیکیانـەی کـارێکی بوونگەرایانـە" نووسـینی یۆهـانز کالیمـاکۆس، بڵاوکەرەوە س. کیرکەگۆر. ئەمە یەکەم جار بوو وشـەی بوونگـەرایی لـە شـێوە دانیمارکیەکەیـدا بـــەکاربهێنرێ، کـــە بـــە مانـــای "دۆخـــی بوونگەرایانە"یـان "پەیوەنـدیی بوونگەرایانـەش دێ. بەمجۆرە کیرکەگۆر کە لە ماوەی پێنج ساڵی ڕابردوودا پتر لـە نیـو ملیـۆن وشـەی نووسـیبوو، هەستی دەکرد شتێکی بۆ گوتن پـێ نەماوە. لـەم ڕووەوە بوو کە بە گوێرەی فەلسەفەکەشی ویستی

لــە ڕێــی هەڵبــژاردنێکی ســەرەکیانەوە خــۆی بخولقێنێــت. هەڵبژاردنەکــەی ئــەو شــتێکی نائاسایی بوو. تا ئەوکاتە لە گۆڤارێکدا بە ناوی Corsairەوە کۆمــەڵێك ڕای بــاش لەســەر چــەند بەشێکی ئەو کتێبانەی نووسرابوو کە بە ناوی خــوازراوەوە بــڵاوی کردبوونــەوە. ئــەم گۆڤــارە تەنزئامێزەی کۆپنهاگن بەوە ناوبانگی دەرکردبوو کــە هێرشــی تونــد و ناشــرینی دەکــردە ســەر کەسێتییە ناسراوەکان. کیرکەگۆر بڕیاری دا لــە ڕێی ناردنی نامەیەکی پڕ تانە و تەشەرەوە بۆ ئەم گۆڤارە" هانی بدات تا هێرش بکاتە سەر خۆی (ئەگەر لە گۆڤارەکەی ئێوەدا وەسفی کەسێك بکرێ، ئەوە وەکو سووکایەتیکردنێکە بۆ ئەو کەســـە) و نـــاوی هەنـــدێ لـــە نووســـەرە بێناوونیشــانەکانی گۆڤارەکــەی ئاشــکرا کــرد (سەرەنجام یەکێك لەو نووسەرانە توانای بوون بە مامۆستا لەدەست دا).

ئەنجامەکە تەواو پێشبینیکراو بوو. چەند مانگێك لەسەر یەك ئەم گۆڤارە کەوتە هێرشکردنە ســەر کیرکــەگۆر. کاریکاتێریــان لەســەر دەکــرد،

گاڵتــەیان بــە ســەر و ســیما و بیروباوەڕەکــانی دەکرد. پێشتر کیرکەگۆر لەناو خەڵکی کۆپنهاگندا وەکـو کەسـێکی نـامۆ و نووسـەرێکی بـەتوانا و ڕۆشنبیرێك ناسرابوو کە ڕووی کردبووە ئایین و، دواجاریش وەکو کەسێك کە دوای تێکشکانی لـە ماجەرایــەکی عاشــقانەدا گۆشــەگیر بووبــوو" سەرنجی کەسی ڕانەدەکێشا" بە تەنها خەڵکانێکی کــەمی لاپرەســەنی سەرشــەقامەکانی کۆپنهــاگن نـەبێت. بـەڵام دوای ئـەو شـتانەی لەگۆڤارەکـەدا لەســەری بڵاوکرانــەوە هــەموو شــتێك گــۆڕا. لــە ئــەنجامی ئــەو وتــار و کاریکــاتێرە یــەك لــە دوایەکانەی لـەو گۆڤـارەدا لەسـەری بڵاوکرانـەوە، کیرکــەگۆر بــوو بــە پیرەمێردێکــی لاوی لاوازی مردەڵـەی چیلکەئاسا کـە وەکـو قـرژاڵ بـە ڕێگـادا دەڕۆیشت و دەرلنگی پانتۆڵەکانی کورت یا درێژ بــوون، چــەترێکی زل و قەبــەی لەگــەڵ خۆیــدا هەڵدەگرت.. و بووە مایەی گاڵتەپێکردنی تەواوی خـەڵك، لـە شـەقامەکانی کۆپنهاگنـدا هەرچـی و پەرچــیەکانی شــار دوای دەکــەوتن و لاســایی ڕۆیشتنەکەیان دەکردەوە. تەنانەت خاوەن کۆگا

گەورەکانی شار و کەسێتییە ناسراوەکانیش بە ئاشکرا پێی پێدەکەنین.

کیرکەگۆر کەسێتییەکی زۆر هەستیار بوو و هەر بۆیە دەزانین ئەو ئازارەی لەم ڕەفتارەوە دووچاری بووە تا چ ڕادەیەك سەخت بووە. بەڵام پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە کە خۆی بووە هۆی ئەو ئازارە بۆ خۆی. لە کاتێکیشا زۆر چاك دەیزانی چی دەکات" بۆچی دەستی دایە ئەم کارە؟ کاتێ دەزانین ئەو خاوەنی کەسێتییەکی ئاڵۆز بووە، وەڵامی ئەم پرسیارەمان لا ئاسان نابێت" بەڵام بێ هیچ گومانێك ئەو ختوورەی بوون بە قوربانی و شەهیدەی کە هەر لە کاتی قوتابێتییەوە لە قوتابخانەی سەرەتایی لەگەڵیدا بوو" لەم مەسەلەیەشدا ڕۆڵی هەبووە. دیسانەوە گومان لەوەدا نییە کە بایەخ نەدانی خەڵك بە کارەکانیشی هۆیەك بووە لە پشتی ئەم مەسەلەیەوە. چونکە ئەوکات تەمەنی گەیشتبوو بە سی و سێ ساڵی و وەکو نووسەر و بیرمەند نەناسرابوو. کەواتە مادامەکی ئەو ناتوانێ

بەناوبانگ بێت، لانی کەم خۆ دەتوانێت ناو زڕاو بێت.

هەڵبەتـــە لـــە پشـــت ئـــەم ڕوخســـارە خودخوازییانـــەوە، کیرکـــەگۆر مەبەســـتێکی ڕاســـتگۆیانە و جیدییانەشـــی هـــەبوو. ئـــەو دەیویست لە ڕێی سووکایەتی پێکردنیەوە ببێـت بـە ئـادەمیزادێکی باشـتر. دەیویسـت لـە ڕێـی ئازارچەشـتنیەوە لەسـەر دەسـتی خـەڵك ببێتـە مەسیحیەکی باشتر. دەیویست ژیانێکی ڕوحیی هـەبێت" کـە لـە ڕوانگـەی ئـەوەوە تاقـە جـۆری بەهاداری ژیان بوو و ئەو شێوازەشی لە پێنـاوی ئەوەدا بوو زیاتر بەرەو ئەو ئاقارە بچێت، دواجار هۆیـەکی تـریش لـە پشـت هـەموو ئـەم هۆیانـەوە هەیە. هەروەکو پاسکال دەڵێت کە تاقە بیرمەندی ئاییینیی هاوچەرخی چەشنی کیرکەگۆرە: "دڵ بۆ خۆی کۆمـەڵێك هـۆی هەیـە کـە ئـەقڵ سـەریان لـێ دەرناکات" و ئەو هۆیەی دڵی کیرکەگۆریش ڕێژین بـوو، دەیویســت ســەرنجی ئــەو بــەلای خۆیــدا ڕابکێشێت، پیشانی بدات کە تا چ ڕادەیـەك ئـازار دەچێژێت.

بەڵام ئەگەر ئەو مەبەستی ئەوە بووبێت کە ڕێـژین بخاتـە ژێـر کاریگـەریی خۆیـەوە" ئـەوا بـە ئاشکرا لەوەدا شکستی هێنـا. هـەر لـەو ڕۆژانـەدا ڕێژین لە لایەن کەسێکی تـرەوە خـوازبێنی کـرا و بـۆ سـاڵی دواتـر شـووی پێکـرد. هەرچـەندە کیرکەگۆر هیچ کاردانەوەیەکی پیشان نەدا" بـەڵام زۆر بە سەختی ئازاری چەشت. ئـەوەی پیشانی دا پیرییـەکی ناوەخـت بـوو کـە ئێخـەی پێگـرت. سـاڵانێکی سـەختی ئـازار و خەڵوەتکێشـی و تەنیایی و هەوڵ و تەقەللای بێوچانی هۆشێك" وا خەریك بوون جەزایان لێ دەسەندەوە. سـەرەڕای دانـایی و زیرەکیـی قـووڵتری ئـەو سـەبارەت بـە دۆخی مرۆیی، بەڵام هێشتا هەر ئاوێزانی خەونە ئەستەمەکەی خـۆی بـوو، واتـە ئـەو خەونـەی کـە هـەر ڕۆژێك دێ بە ڕێـژین بگـات (هێشتا ڕۆژانـی یەکشەممە لە کڵێسادا یەکتریان دەبینی).

لـە نیسـانی سـاڵی ١٨٤٨دا کیرکـەگۆر بـە ئـەزموونێکی ئایینیـدا تێدەپـەڕێت. لـە یادەوەرییەکانیدا نووسیی: "تـەواوی سروشـتی مـن گـۆڕا.." گەیشـتە ئـەو بـاوەڕەی کـە بـە تـەنها

خۆشەویستیی خوایە کە دەتوانێ ئەو لەو بیرکردنەوە توندڕەوانەیەی لە خودی خۆی ڕزگار بکات. لەوکاتە بەدواوە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ و بەبێ خۆشاردنەوە لە پشت ناوی خوازراوەوە" لە ڕێی قسەکانی خوداوە وەعزی دا ئەدا. ئەو پێنج شەش کتێبەی کە لە سێ ساڵی دواتردا بڵاوی کردنەوە" بۆ ئەم بابەتە تەرخان بوون.

تێگەیشتن و بۆچوونی کیرکەگۆر بۆ ئایین ناهاوسەنگ بوو و بە تەنها لەگەڵ حاڵی قدیسان و خەڵوەتکێشە سوێندخواردووەکاندا وێک دەهاتەوە. بە بۆچوونی کیرکەگۆر: "تەواوی بوونی مرۆیی بەرامبەر خودا وەستاوە". بیرۆکەی کەوتنەخوارەوە- یان دابەزین (بە واتای دابەزینی ئادەم لە بەهەشتەوە بۆ سەر زەوی- و-) - بێبەشبوونی ئادەمیزاد لە چاودێریی خودایی لە بەهەشتدا- تەوەری هزری ئایینیی کیرکەگۆر (و سەرچاوەی دەروونناسییە تایبەتیەکەی ئەو) پێکدەهێنێت.

بە بۆچوونی ئەو خۆپەرستی کە دیارترین دەربڕی بریتییە لە غەریزەی سێکسی" بووەتە

مایــەی دابــەزینی ئــەو لــە بەهەشــت. هــەروەکو عادەتیشـە لێرەشـدا کاسـەکە بەسـەر سـەری ژنـدا شـکاوەتەوە. ئـەو نووسـیی: "ژن هـەمان ڕۆحـی بەرجەسـتە بـووە.. تـەواوی مەسـەلەی ژن و پیـاو پـــیلان و فێڵێکـــە کـــە بـــە وردی داڕێـــژراوە بـــۆ لـــــەناوبردنی پیـــــاو بـــــەو ســـــیفەتەی ڕۆح و مانەوییەتــە". تاقــە وەڵامــیش بــۆ ئــەم دۆخــە، دوورەپەرێزییـــە لـــە ژن و دوورکەوتنەوەیـــە لـــە هاوسەرێتی بە پێودانگێکی جیهانی. لە ڕوانگەی ئـەوەوە خواسـتی خـودا تـەنها لـە ڕێـی نـەمانی وەچەی مرۆڤییەوە دێتە دی.

ئەوەی سەرنجڕاکێشە ئەوەیـە کە لـە پـاڵ ئـەم توڕەهاتە پێکەنینهێنەدا، کیرکەگۆر بیروبۆچوونی بەهادار دەخاتەڕوو. بـۆ جارێکی دی سـەرگەرمی هیگــل دەبێتـــەوە و لـــە شـــێوەی ڕەخنەیـــەکی وێرانکــەردا دەیــەوێت ڕووە لــە خشــتەبەرەکەی ڕێبـــازی هیگـــڵ و بێتواناییـــە ســـۆزبزوێنەکەی سەبارەت بە ڕوونکردنەوەی "بوون" پیشان بدات. کیرکـەگۆر جـەخت لەسـەر ئـەوە دەکـات کـە ئێمـە ناتوانین بە شێوەیەکی ئەقڵی و فیکری و لـە ڕێـی

دروستکردنی سیستمە قەبە و گەورە فەلسەفییەکانەوە لە "بوون" بگەین.

هەر ئەوەندە کەسێك لە ڕێی بیرکردنەوەیەکی ئەقلانیانەوە "بوون" بناسێنێت، ئیدی شوێنێك بۆ ئیمان نامێنێتەوە.

لە کتێبی "نەخۆشی تامردن"دا کیرکەگۆر "نائومێدی" شی دەکاتەوە و بە بێتوانایی لە قەڵەم دەدات لەوەدا کە "بمانەوێ ئەو خودە بین کە بە ڕاستی هەین"، کە ئەمەش دۆخێکی خەتەرناکە. ئەو حوکمەی کیرکەگۆر لەگەڵ ئەو قسەیەی پێشوویدا یەکناگرێتەوە کە دەڵێت "خود" بوون نییە بەڵکو هەبوونە "صیرورة"، لەبەر ئەوەی لەم حاڵەتەدا ئەو "خودەی.. کە بە ڕاستی هەین" لە ئارادا نییە. بۆ هەلاتن لەم ڕەخنەیە کیرکەگۆر بە "خودێك کە لە ناوماندا شاراوەیە" (یان خودێك کە بە شێوەیەکی کردەیی تیاماندایە –و–) وەڵام دەداتەوە. بەڵام ئایا بەلای هەرکەسێکەوە شتێك نییە پێی بوترێ "خودی ڕاستەقینە" یان "خودی کردەیی– یان خودی بەزەبر (بالقوة)–"؟

جیاوازییەکی زۆر لەوەدا هەیە کە بڵـێین هـەر کەسێك خاوەنی کۆمەڵێك توانای جۆراوجۆرە کە دەشێ دژ بە یەك یان نەفیکەرەوەی یەکتر بن و لەگـەڵ ئـەوەدا کـە بڵـێین هەرکەسـێك "خـودێکی بـەزەبر"ی هەیـە. زۆربـەی ئادەمیزادەکـان هـەر لـە سـەرەتای ژیانیانـەوە ڕووبـەڕووی کۆمـەڵێك هەڵبـژاردنی جۆراوجـۆر دەبنـەوە، کـە دەکـرێ هەریەك لەوانە بە ڕەچاوکردنی "ڕاستگۆیی لەگەڵ خـودی خۆیـدا" –واتـە وەدیهـاتنی هەنـدێ یـان هەموو تواناکانی –هەڵببژێردرێ. کەس ناتوانێت تـەواوی توانـا بـە زەبرەکـانی بهێنێتـە دی. (ئەگەرچـی ئـەلبێرت شـڤایتزەر مۆسـیقازانێکی پرۆفێشناڵ بوو، بەڵام لـە ئەفریقادا پزیشـکێتیی بۆ ژیانی خۆی هەڵبژارد. کام لەم دووانە "خودی ڕاستەقینە"ی ئەو بوون؟). لـە بنەڕەتدا لـە پشت هـەر بانگەشـەیەکەوە بـۆ گـۆڕان بـەرەو "خـودی ڕاسـتەقینە"، ئەگـەر پێشـتر ئـەو خـودە دیاریکرابێـت" جۆرێـك لـە مەبەسـت و نیـازی پێشوەخت هەیە. تەنانەت گەر بەر لە دیاریکردنی پێشـوەختی ئـەم "خـودە ڕاسـتەقینە"یـە لـەو

بڕوایـەدا بـین کـە دەتـوانین ئـەو خـودە کەشـف بکـەین" دیسـانەوە هـیچ لـەو حوکمـەی سـەرەوە ناگۆڕێت. چونکە کەشفکردنیش وەك دۆزینەوەی شـتێکە کـە پێشـتر هـەبووە. پێدەچـێ باشـترین بەڵگەهێنانـەوەش بـۆ ئـەم مەسـەلەی "کەشـفی خود"ە هەر ئەوە بێت کە کیرکەگۆر پێشتر بەکاری هێنـاوە، ئـەو باسـی لـە "هەڵبـژاردن لـە پێنـاوی خوڵقانـدنی خـود"دا دەکـرد. ئەمـە هـەمان ئـەو ئازادییە ڕاستەقینە و (نیگەرانی خوڵقێن)ەیە کە کیرکەگۆر پێشتر جەختی لەسەر کردبوو.

بگەڕێینـەوە سـەر بابـەتی نائومێـدی. بـە ڕای کیرکـەگۆر نائومێـدیی هوشـیارانە وەختـێ دێتـە ئاراوە کە ئەو کەسە لە ڕێی شـتێکی دەرەکییـەوە خـودی خـۆی بناسـێنێت (بـۆ نموونـە بـوونم بـە ئینشتاینێکی تر). بە ئاقارێکی وەها تاکە کەس خــۆی بەرامبــەر بــە هەڵبــژاردنی چــارەنووس دادەنێت، بە نەگەیشـتن بـەو ئامانجـەش، خـودی بڵنـدڕۆی وەدی نایـەت و ئـەویش ناتوانـێ لـەو دۆخـەی خـۆی قایـل بێـت. لـەم ڕووەوەیـە کـە

بۆشـــاییەکی دەروونـــی و ئـــارەزووی نەســـت (لاشعور)انەی مەرگ پەیدا دەبن.

نائومێدیی هوشیارانە هەیە و لە دوو شێوەدا خۆی دەنوێنێت. شێوە نادروستەکەی کاتێکە کە تاکەکەس دەزانێ کە نائومێـدە بـەڵام وا دەزانێـت کە کەسانی دی وانین ("کەس نازانێـت مـن چـەند ئازار دەچێژم") ئەمە ئەو بەرەو نائومێدیی زیـاتر دەبـات، لـە کاتێکـا کـە لـە شـێوە دروسـتەکەی نائومێدیی هوشیارانەدا، تاکەکەس تێدەگات کـە لە ڕاستیدا نائومێدی بەشێکە لە دۆخی مرۆیی و لەم ڕوانگەیەشەوە نائومێدی بەشێکە لە "خود". ئـەم نائومێدییـە بەنـدە بـە خـودێکی هوشـیارەوە. تاقـــە ڕێـــی دەربـــازبوون لـــەم نائومێدییـــەش "هەڵبژاردنی خود" و بزاوتنە بەرەو پلەی ئیمان. لێرەدایە کە کیرکەگۆر دەستی خۆی دەخاتە ڕوو: تاقە "خودی ڕاستەقینە" هی کەسێکی ئیماندارە.

کیرکـەگۆر تـا سـەرەتاکانی دەیـەی چـوارەمی ژیانی لەسەر نووسین بەردەوام بوو. ئیـدی تـەواو پیرتـر لـە تەمـەنی خـۆی دەهاتـە بەرچـاو و ئـەو میراتییەی لە باوکیشیەوە بۆی مـابووەوە ڕووی لـە

تەواوبوون بوو و پێویستی بەوە بوو کار بکات. بەڵام تاقە کارێك هەبوو کە لەوە دەچوو بیتوانیایە بیکردایە، ئەویش کاری قەشەیی بوو. هەرچەندە پێدەچوو خۆی بۆ ئەو ئەگەرەش ئامادە کردبێت، بەڵام لە ناخیدا شتێك هەبوو کە ڕێی ئەوەی لێ دەگرت. نەیدەتوانی بەوە قایل بێت کە ئایینەکەی بکاتە وەسیلەیەك بۆ گوزەران. لە سەرێکی تریشەوە تێگەیشتنی ئەو بۆ مەسیحیەت لەگەڵ کڵێسای ڕەسمیی دانیمارکدا زۆر جیاواز بوو.

کیرکەگۆر بڕیاری دا ئەو شێواندنانەی ئایینی مەسیحی ئاشکرا بکات کە کڵێسای دانیمارکی ڕایدەگەیاند. بۆ ئەو مەبەستە گۆڤارێکی بە ناوی "چرکەسات"ەوە دامەزراند، گەرچی باری دارایی بەرە و کزی دەچوو. هەر خۆیشی بە تەنیا بووە هەمەکارەی گۆڤارەکە. لە یەکێك لە ژمارەکانی ئەم گۆڤارەدا هێرشی کردە سەر کڵێسا و بە "دەزگا" ناوی برد و، یەکێك لە خۆشەویسترین قەشەکانی ئەم کڵێسایەشی بە دنیاپەرست و ڕیاکار لە قەڵەم دا (لە هەمووشی خراپتر ئەوە بوو کە قەشەکە هیگلییش بوو). لە ژمارەیەکی تردا نووسیی

ئەگەر ئەوەش ساغ بێتەوە کە مەسیح بوونێکی دەرەکیی نەبووە، کڵێسا بەبێ هیچ گۆڕانکارییەك هەر لە سەر کاری پێشووی خۆی بەردەوام دەبێت و بە تەنها ژمارەیەکی زۆر کەمی قەشەکان ئامادە دەبن دەسبەرداری خۆشگوزەرانیەکانیان بن.

هەروەکو چاوەڕوان دەکرا، ئەم هێرشانە بوونە مایەی هەرا و زەنایەکی نوێ. چیدی کیرکەگۆر نەیدەتوانی ببێتە قەشە. لە زۆر ڕووەوە ڕیسواییەکەی گۆڤاری Corsair دووبارە بۆوە و دیسانەوە کیرکەگۆر کەوتەوە بەرچاوان. (هەر زوو وتارەکانی بۆ سویدی وەرگێڕران و لە سەرانسەری ئەسکەندناڤیادا دەنگی دایەوە). دەتگوت دونیا دەیەوێ هەق لە کیرکەگۆر بسێنێتەوە. ناوبانگێکی هاوشان بە ناوزڕان و تەرەکردن" تاقە ناوبانگێك بوو کە دەیتوانی قبووڵی بکات. لە سەرێکی تریشەوە دەنگدانەوەی کردەوەکەی باوکی تیا دەبینرایەوە وەختێ لەنێو شاخ و داخەکاندا قسەی بە خودا گوت.

هەر لەو کاتانەدا مێردەکەی ڕێژین کرابوو بە فەرمانڕەوای دوورگە کۆڵۆنیەکان لە دەریای

كاريبى و هەڵبەت كيركەگۆر لەمە بە ئاگا بووە. ئيدى نازانين تا چ ڕادەيەك سەفەرە دوور و درێژ و كتوپڕەكەى ڕێژين لەم كاتەدا نەستى كيركەگۆرى بۆ زياتر هەرا و زەنانانەوە هان داوە.

لە نيسانى ١٨٥٥ دا و سەر لە بەيانيى ئەو ڕۆژەى قەرار بوو ڕێژين و هاوسەرەكەى بچن بۆ شوێنى كارى تازە، ڕێژين واى كرد كە لەسەر يەكێك لە شەقامەكان كيركەگۆر ببينێت. لەم ڕووبەڕووبوونەوە كورتەدا ڕێژين هەڵوەستەيەكى كرد و بە ئاراميیەوە بە كيركەگۆرى وت: "خوا پشت و پەنات بێت، هيوادارم لە هەموو شتەكاندا سەركەوتوو بيت". كيركەگۆريش لە ڕووى ڕێزەوە كڵاوەكەى بۆ بەرزكردەوە و ئيدى هەريەكەيان بە ڕێى خۆياندا ڕۆيشتن. پاش چواردە ساڵ لە هەڵوەشانەوەى دەزگيرانێتيەكەيان" ئەمە يەكەمجار بوو لەگەڵ يەكدا قسە بكەنەوە و بەڵام قەرار بوو كە دوا ديداريش بێت.

ئەو بێهێزييەى ڕۆژانە هەستى پێدەكرد و ئەو گرژييەى كە لەگەڵ كڵێسادا هەيبوو، سەلامەتيى كيركەگۆريان خستبووە مەترسييەوە. حەوت

مــانگ دوای ســەفەرەکەی ڕێــژین“ کیرکــەگۆر ڕۆژێکیان لەسەر یەکێك لە شەقامەکاندا لە هـۆش خـۆی چـوو و بردیـان بـۆ نەخۆشـخانە و لـەوێ خەواندیان. دوا پارە و پوولی خۆی بۆ دوا ژمارەی "چرکەســات" خــەرج کــرد. لــەو لاوازی و نائومێدییەیدا، کە لە ورد و درشتی ڕەهەندەکانی بـە ئاگـا بـوو“ حـەزی ژیـانی لەدەسـت دا“ بـەڵام هــەرگیز ئیمــانی لەدەســت نــەدا. ئەوانــەی لــەو دواڕۆژانــەی ژیانیــدا بینیبوویــان درەوشــانەوەی چاوەکانیان بیر ماوە لەناو ڕوخسارێکی باریك و پیردا.

کیرکەگۆر لە ١١ی تشرینی دووەمی ١٨٥٥دا و مانگێـك پـاش کـەوتنی لـە خەسـتەخانە، کۆچـی دوایی کرد. وەسیەتیشی کرد ئەو شتانەی کە لە دوای جێدەمێنێت“ بیدەن بە ڕێژین.

بـە پێچـەوانەوەی ئـەوەی چـاوەڕێ دەکـرا، لـە ڕێــوڕەسمی ناشــتنی تەرمەکــەی کیرکــەگۆردا خــەڵکێکی زۆر ئامــادە بــوون. خوێنــدکارەکانی زانکــۆ کێبــەرکێیان بــوو لەســەر هــەڵگرتنی تەرمەکەی. هەروەکو خۆیشی حەزی پێدەکرد لـە

ڕێوڕەسمی ناشتنەکەشیدا هەرا و زەنا پەیدا بوو. دەستەیەك لەسەر ڕیاکاریی کڵێسا و ناقایلییان بەوەی تەرمەکەی لە گۆڕستانی کڵێسادا بنێژرێ" ناڕەزاییان پیشان دا. کەسێکی تر هەندێ وتاری ڕەخنەگرانەی ئەوی خوێندەوە و لەناو حەشاماتەکەدا دەنگ بەرز بۆوە و بوو بە هەرا..

(لەسەر کێلی گۆڕەکەی ئەم دێڕانە نووسران:

سۆرین کیرکەگۆر، لە ٥ی ئایاری ١٨١٣دا هاتە دونیاوە، لە ١١ی تشرینی دووەمی ١٨٥٥دا کۆچی دوایی کرد.

پاش تێپەڕینی زەمەنێکی کورت" سەرەنجام ڕزگارم بوو. تەواوی نەبەردەکان کۆتاییان هات. ئەوەتانێ من لەو هۆڵانەدا کە لە گڵی سوور دروستکراون لەگەڵ مەسیحەکەی خۆمدا کەوتوومەتە گفتوگۆ، گفتوگۆیەکی بێ کۆتایی..)

# پاشبەند

هەر زوو کیرکەگۆر لەبیر چووەوە. تەنها لە سەرەتاکانی سەدەی بیستدا بوو کە سەرلەنوێ بایەخی پێدرایەوە. بیروڕاکانی ئەو لە ئەڵمانیادا بە فەلسەفەیەکی هاوشانی ڕێبازە نوێیە دەروونشیکارییەکەی فرۆید لە قەڵەم درا.

"هۆسێرل"ی دامەزرێنەری دیاردەناسی (فینۆمینۆلۆژیا) بیروڕاکانی کیرکەگۆری بەرەو پێش برد بەوەی کە هەوڵ (ێکی ناسەرکەوتوو)ی دا تا شیکردنەوەی فەلسەفییانەی هوشیاری لە شێوەی زانستێکی ئەقڵانیدا دابڕێژرێت. وەکو لە هەر شکستێکی فەلسەفیشەوە چاوەڕوان دەکرێ، ئەم هەوڵە ناسەرکەوتووە لە ڕوانگەی فەلسەفییەوە بە پیت بوو. ئەوە بوو قوتابی و هاوکارەکەی هۆسێرل، واتە هایدیگەر کە

بیروڕاکانی کاریگەرییەکی قووڵیان کردە سەر هزری ئەوروپایی لە سەدەی بیستەمدا، بیروبۆچوونەکانی کیرکەگۆری قۆناغێك بەرەو پێش برد.

زۆربەی ئەم فەلسەفە نوێیە بە ئێگزیستانسیالیزم (بوونگەرایی- وجودیەت) ناودەبەن و کیرکەگۆریش بە دامەزرێنەری دەزانن. بوونگەرایی هەوڵێکی هزری خۆرئاوایی بوو بۆ خستنەڕووی فەلسەفەیەکی نائەقڵانی. لەم ڕووەوە کەس نکووڵی لە سەرکەوتنی ناکات، بەڵام ئەو پرسیارەش دەکرێ کە ئایا ئاقارێکی لەمجۆرە لە بنەڕەتدا شیاوی تەسەورە؟ بە پێچەوانەی فەلسەفە ئەقڵانییە نوێیەکان یا کۆنەکانەوە بوونگەرایی فەلسەفەیەکی تەواو خودگەرایە. لەم ڕووەوە ڕەنگە وا بزانرێ کە باس و گفتوگۆ لەگەڵ فەیلەسووفێکی بوونگەرادا زۆر زەحمەت بێت، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە کە پەیڕەویکارانی ئەم ڕێبازە بە باس و گفتوگۆکانیانەوە ناسراون. لە ڕوانگەی کیرکەگۆرەوە "بوون" لە سەروو هەموو زانست

(ئەقلانیەت)ێکەوەیە. قەرار بوو بوونگەرایی لە رێی ژان پۆڵ سارتەرەوە بگاتە لووتکە (یان نشێو)ی خۆی.

خودی ناونیشانی بوونگەرابییش پاش ئەوەی یەکەمجار کیرکەگۆر دایهێنا" ماوەیەك لەبیرچووەوە، تا ئەڵمانیەکان دووبارە زیندوویان کردەوە و پاشانیش ڕەتیان کردەوە. چ هۆسێرل و چ هایدگەر قایل نەبوون پێیان بگوترێ بوونگەرا. لەبەرئەوەی هەستیان دەکرد کە مۆرکێکی لەو جۆرە سنوور بۆ فراوانیی فەلسەفەکەیان دادەنێت. سەرەنجام سارتەر کە سەودای فراوانی و گشتگیری نەبوو" یەکەمین کەس بوو کە لە سەرەتای چلەکانی سەدەی بیستدا خۆی بە بوونگەرا ناساند. لە کۆتایی ئەو دەیەیەدا بوو کە ئیدی سارتەر و بوونگەرایی پێکەوە دەناسران. سارتەر دانی بەوەدا دەنا کە کیرکەگۆر ڕۆڵی لە دامەزراندنی بنەما سەرەتاییەکانی بوونگەرابییدا هەبوو، بەلام جەختیشی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە بوونگەرابییەکەی خۆی هیچ پەیوەندییەکی بە

کیرکەگۆرەوە نییە. ئەم حوکمە دیارە تەواو بە مەیلی خودی کیرکەگۆریش بووە، لەبەرئەوەی ئەو بێکۆت و بەندی و بێ خوداییەی کە لە فەلسەفەکەی سارتەردا ڕۆڵێکی سەرەکییان هەبوو" لە فەلسەفەکەی کیرکەگۆردا جێیان نەدەبۆوە.

## لە نووسینەکانی کیرکەگۆرەوە

- یەکەمین شتێك کە دەبێ تێبگەیت ئەوەیە کە تێناگەیت.
- لە سەرەتای لەدایکبوونمانەوە ئێمە بە کۆمەڵێك فەرمانی سەرمۆرەوە بۆ سەفەری ژیان نێردراین.
- مرۆڤ چەند بتوانێت شتەکان لەبیربکات هێندە ژیانی دوچاری هەڵکشان و داکشان دەبێت، چەندیش بتوانێت شتەکان لە بیریدا بپارێزێت ژیانی یەزدانی دەبێت.
- دوای مردنم لەناو نووسینەکانمدا کلیلێك بۆ ژیانم نادۆزنەوە (ئەمە تەسەللایەکە بۆ من). کەس ناتوانێ وشەگەلێك بدۆزێتەوە کە هەموو شتەکان روون دەکەنەوە و ئەوەی کە جیهان بە بێبایەخی دەژمێرێت دەیگۆڕن بە رووداوێکی

گرنگ بۆ من، یان ئەوەی کە پاش لاچوونی مینا (لێرەدا بە مەجازی مینای ددان بەکارهاتووە- و-) کەی دەردەکەویٚ من تەواو بێبایەخ سەیری دەکەم.

- ئامانجی ژیانی من دەربڕینی حەقیقەت بووە، بەو شێوەیەی کە من دەیبینمەوە، بەڵام تەواو بەدەر لە هەر جۆرە دەسەڵات و سەرچاوەیەك. بەدەر لە دەسەڵات و سەرچاوە و، بەوەی کە خەڵکی وا لیٚ بکەم پشت بە هیچ نەبەستن، حەقیقەت دەردەبڕم و خوێنەر دەخەمە دۆخێکی پڕ دژایەتییەوە کە تاقە ڕێی ڕزگاربوون لێی ئەوەیە کە حەقیقەتی خۆیان بخولقێنن.

- لەگەڵ هەر هەنگاوێکدا بۆ پێشەوە" فەلسەفە کاژێك فریٚ دەدات. کەللەڕەقە بێکەڵکەکانیش دەخزێنە ناو ئەم کاژە کۆنانەوە و لەوێدا جیٚ بۆ خۆیان خۆشدەکەن.

- ئەگەر هیگل لۆجیکەکەی خۆی تەواو کردبا و لە پێشەکییەکەیدا نووسیبای کە ئەوە تەنها ئەزموونێك و مەشقێکی فیکرییە کە لە میانیدا چەندین گریمانەی پاساونەدراو بەکارهاتووە، بێگومان دەبوو بە گەورەترین بیرمەندی هەموو

ڕۆژگارەکان. بەڵام بەو شێوەیەی ئێستای، هیگل زیاتر لە نوکتەیەك دەچێت.

- تەواوی ئەو مرۆڤە ئاوارتانەی کە بە درێژایی سەدەکانی ڕابردوو پەرتەوازە بوون، هەرەکەیان حوکمی خۆی سەبارەت بە "مرۆڤبوون" داوە. یەکێك گوتوویەتی مرۆڤ جۆرێکە لە گیانەوەر، یەکێکی دی گوتوویەتی مرۆڤ بوونەوەرێکی ڕیاکارە و یەکێکی تریش گوتوویەتی کە مرۆڤ بوونەوەرێکی درۆزنە و شتی تری لەم بابەتە.

لەوانەیە بۆچوونەکەی من زۆر دوورکەوتبێتەوە" من دەڵێم مرۆڤ چەنەبازە و بەهرەی قسەکردن ئەوی بۆ ئەم کارە هانداوە.

بە هۆی هێزی قسەکردنەوە هەر کەسە لە پلەی بەرز بەهرەمەند دەبێت –بەڵام بە تەنها بە هۆی قسەوە– و لەم کارەشیدا زۆری پێوە دەنێت، کە بە هەمان ڕادە مایەی پێکەنینە کە کەسێك دوای ئەوەی لە پیشانگایەکدا تابلۆی دەعوەتی شاهانە دەبینێت" لافی ئەوە لێبدات کە لە دەعوەتەکەدا بەشدار بووە.

مــن ئەگــەر کابرایــەکی بێبــاوەڕ بوومایــە دەمگــوت خواوەنــدەکان بۆیــە ئــەم هونــەری قسـەکردنەیان بـە ئـادەمیزاد بەخشـیوە تـا کـاتی خۆیــان بــە تەماشــاکردنی ئــەم خۆفریودانــە گاڵتەجاڕانەیەوە سەرگەرم بکەن.

بـەڵام لـە ڕوانینێکـی مەسـیحیانەوە پێویسـتە بڵێم کە خواوەند لە ڕووی خۆشەویستییەوە ئەم بەهرەیەی بە مرۆڤ بەخشـی‌" تـا بـەرەو پـەیبردنی دروسـتی یـەزدان ڕێنمـایی بکـات. بـەڵام نـازانم ئـاخۆ خواوەنـد بـە چ حەیفێکـەوە لـە بـەرەنجامی ئەم لوتفەی خۆی ڕوانیبێت؟

له "یادەوەرییەکان"ەوە

◆ فەلسەفە لەسەر هەقە کە دەڵێت دەتـوانین ژیـان بـەرەو دواوە تێبگـەین، بـەڵام عادەتـەن لـەو بنەمایەی دی خافڵ دەبین کـە دەبـێ ژیـان بـەرەو پێشــەوە بەســەر بــەرین. کاتــێ ســەرنجی ئــەم بنەمایەی دوایی دەدەین‌" بێگومان دەگەینـە ئـەو ئەنجامـەی کـە هـەرگیز نـاتوانین بـە دروسـتی لـە ژیان لـە زەمانـدا تێبگـەین، لەبەرئـەوەی نـاتوانین

هیچ چرکەساتێکی ژیان بوەستێنین تا ئاوڕی لێ بدەینەوە و سەیری بکەین.

♦ ئەگەر لە سەردەمی سوکراتدا زانست هێندەی ئەم ڕۆژگارە پێشکەوتوو بووایە، ئەوا سۆفیستەکان و تەواوی ئەوانەش کە لافی فێرکردنی فەلسەفەیان لێدەدا دەبوون بە ئەهلی زانست و بۆ ڕاکێشانی کڕیاریش بەلای خۆیاندا" یەکی مایکرۆسکۆبێکیان بە پشتی دەرگاکانیاندا هەڵدەواسی و لە لایەوە دەیاننووسی: خەڵکینە وەرن و لە مایکرۆسکۆبەوە سەیربکەن و بزانن مرۆڤ چۆن بیردەکاتەوە (خۆ ئەگەر سوکراتیش ئەم ئاگادارییەی بخوێندبایەتەوە دەیگوت "ئەو ئادەمیزادانەی کە بیرناکەنەوە ڕێك بەمجۆرە ڕەفتار دەکەن").

♦ وەچەی مرۆیی چیدی لە خودا ناترسێت. ئەوەتانێ ئێستا بەم شێوەیە سزا ئەدرێ. لەمەودوا لە خۆی دەترسێت. ئەوەتانێ ئێستا تامەزرۆی خەون و خەیاڵاتە و لە ئاست ئەم مەخلوقەی خۆیدا لە ترساندا هەڵدەلەرزێت.

(لە هەڵبژاردەی بڕگە کورتەکانەوە)

- وەختــێ ئێمــە بــە شــێوەیەکی بابــەتی مەسەلەی حەقیقەت دەخەینەڕوو" هزری ئێمە بە شێوەیەکی بابەتی سەرنجی حەقیقەت ئەدات و بــە بابــەتێکی لــە قەڵــەم دەدات کــە بیرکــەرەوە پەیوەنـدیی لەگەڵـدا هەیـە. بـەڵام سـەرنجی ئـەم پەیوەندییە نادەین، بەڵکو تـەنها سـەرنجی ئـەو مەسـەلەیە ئـەدەین کـە ئایـا ئـەوەی بیرکـەرەوە پەیوەنـدیی لەگەڵـدا هەیـە حەقیقەتـە یـان نـەء. ئەگـەر حەقیقـەت بێـت" دەڵـێن ئـەو حەقیقـەت دەزانێت. بەڵام ئەگەر بە شێوەیەکی خودگەرایانە حەقیقەت ڕەچاو بکـەین" هـزری ئێمـە بـە خـودی پەیوەندییەکــەوە بەنــد دەبێــت. ئەگــەر ئــەم پەیوەندییــە ڕاســتەقینە بێــت، بــە شــێوەیەکی خودگەرایانە حەقیقەت دەزانین، تەنانەت گەر ئەو بابەتە دەرەکیەی ئەم پەیوەندییە" ڕاستەقینەش نەبێت.
- خودگــەرایی، مەســەلە دەروونییەکــەی حەقیقەت، ئەمە تێزی منە.

ئیمـان شـتێکی بێمانایـە. بابەتەکـەی تـەواو نامــەعقول و نەشــیاو و بــەدەر لــە هــەر

پاساودانێکە. کەسێك بهێنەرە بەرچاوی خۆت کە بڕیـاری داوە ئیمـان بهێنێـت! بـا بـە دووی ئـەم کۆمێدیایەدا بچین. ئەو دەیەوێ ئیمانی هەبێت و لـە هـەمان کاتیشـدا دڵنیـا بێـت کـە هـەنگاوی دروست دەنێت.

بەم پێیە دەسـت دەکـات بـە لێکۆڵینەوەیـەکی بابەتیانەی ئەو ئەگەرەی کە لەسەر هەقە. چی ڕوو ئەدات؟ بە هـۆی ئـەم لێکۆڵینەوەیـەوە، شـتە بێماناکـەی ئیمـان دەبێتـە شـتێکی دی، دەبێتـە شتێکی شیاو، تا شیاوتریش بێت بێ ئەندازە و بـە شـێوەیەکی کامـڵ شـیاو دەبێـت. ئینجـا ئـەو ئامادەیە کە باوەڕ بکات و بە خـۆی بڵێـت کـە بـە پێچەوانەی خەڵکی ڕەمـەکیی کوچە و بازاڕەوە" بـە تـەنها پـاش بیرکردنـەوەی قـووڵ و پـەیبردنی دروستی شیاوێتیی بابەتی ئیمانەوەیە کە ئەو باوەڕی پـێ دەکات. بـەڵام ڕێـك لێرەدایـە هەسـت دەکـات کـە بـاوەڕکردن بـەوە بەلایـەوە شـتێکی ئەسـتەمە. ئـەوەی کـە تـا ڕادەیـەك شـیاوە، یـان شیاوە، یان بـێ ئەندازە و بـە شـێوەیەکی تـەواو شـیاوە، شـتێکە تـا ڕادەیـەك دەیزانێـت، یـان

دەیزانێت، یان بێ ئەندازە و بە شێوەیەکی تەواو "دەیزانێت"، بەڵام "باوەڕکردن پێی" ئەستەمە. لەبەرئــەوەی بێمانــا بابــەتی ئیمانــە و تاقــە بابەتێکیشە کە دەکرێ باوەڕی پێ بکەین.

لە ( پاشبەندێکی نازانستی )یەوە

## کرۆنۆلۆژیای ڕووداوە فەلسەفیە گرنگەکان

سەدەی ٦ی پ.ز سـەرەتای فەلسـەفەی خۆرئـاوا بـە بـیرو ڕاکـانی تالیسـی مـاڵتی دەستپێدەکات.

کۆتـایی سـەدەی ٦ پ.ز مردنـی فیتاگۆرس.

٣٩٩ پ.ز لە ئەسینا حوکمی مەرگ بەسەر سوکراتدا دەدرێ.

٣٨٧ پ.ز ئـەفلاتون لـە ئەسـینا ئەکادیمیاکەی خۆی دادەمەزرێنێت، کە بە یەکەم زانکۆ دادەنرێ.

٣٣٥ پ.ز ئەرسـتۆ لـە ئەسـینادا خوێندنگەی لیسەووم دادەمەزرێنێت کە کێبەرکێ لەگەڵ ئەکادیمیادا دەکات.

٣٢٤ پ.ز "کۆنستانتین"ی ئیمپراتۆری ڕۆما، ئیمپراتۆریەت بۆ شاری بێزەنتە دەگوێزێتەوە.

٤٠٠ ز سانت ئۆگستین کتێبی "دانپیانانەکان" دەنووسێت، فەلسەفەش دەبێتە شتێکی ئەستەم لە تیۆلۆجیای مەسیحیدا.

٤١٠ ز ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆما لەسەر دەستی ڤیزیگتەکان و سەرەتای چاخە تاریکەکان.

٥٢٩ ز داخستنی ئەکادیمیای ئەسینا بە فەرمانی ئیمپراتۆر یۆستینین، کە ئەمەش نیشانەی کۆتایی چاخی دانایی یۆنانە.

ناوەڕاستی سەدەی ١٣

تۆماس ئاکویناس ڕاڤەی خۆی لەسەر ئەرستۆ دەنووسێت. چاخی فەلسەفەی سکولاستیک.

١٤٥٣ کەوتنی بێزەنتە لەسەر دەستی تورك و کۆتایی ئیمپراتۆریەتی بێزەنتە.

١٤٩٢ کریستۆف کۆڵۆمبۆس دەگاتە ئەمریکا. چاخی ڕێنیسانس لە شاری فلۆرەنسا و سەر لە نوێ زیندوو کردنەوەی دەستوورەکانی یۆنان.

کۆپەرنیکۆس کتێبی "دەربارەی سووڕانەوەی هەسارە ئاسمانیەکان"ی بڵاو کردەوەو لە ڕووی ماتماتیکیشەوە سەلماندی کە زەوی بە دەورە خۆردا دەسووڕێتەوە.

کڵێسا گالیلۆی ناچار کرد کە بە ڕەسمی نکووڵی لە تیۆرەی سەنتەربوونی خۆر بکات.

دیکارت "ڕامانەکان"ی خۆی بڵاو دەکاتەوە.

کتێبی "ئاکار"ی سپینۆزا پاش مەرگی خۆی مۆڵەتی بڵاوکردنەوەی دەدرێتێ.

نیوتن کتێبی "بنەماکان" بڵاو دەکاتەوەو تیایدا باس لە چەمکی کێشکردن دەکات.

١٦٨٩ لۆك "نامەیەك دەربارەی تێگەیشتنی بەشەر" بە چاپ دەگەیەنێت. سەرەتای چاخی فەلسەفەی ئەزموونگەرایی.

بێركلی كتێبی "بنەماكانی زانستی مرۆیی" بڵاو دەكاتەوەو ئەزموونگەرایی بەرەو سنوورێكی نوێتر دەبات.

مەرگی لایبنیتز.

١٧٣٩-١٧٤٠ هیـــوم "نامەیـــەك سەبارەت بە سروشتی مرۆیی" بڵاو دەكاتەوەو ئەزموونگەرایی بەرەو سنوورێكی مەنتیقیتر دەبات.

كانت كە لە ڕێی "هیوم"ەوە لە خەوی دۆگمای خۆی بە ئاگا هاتۆتەوە كتێبی "ڕەخنە لە ئەقڵی پەتی" بڵاودەكاتەوە. چاخی شكۆمەندی میتافیزیكای ئەڵمانیا دەستپێدەكات.

هیگل كتێبی "فینۆمینۆلۆجیای ڕۆح" بڵاو دەكاتەوە، كە لووتكەی میتافیزیكای ئەڵمانە.

شۆپنهاوەر كتێبی "جیهان وەكو ئیرادەو وێنا كردن" بڵاو دەكاتەوەو لە میتافیزیكای ئەڵمانیدا فەلسەفەی هیندی دەخاتە ڕوو.

نیچە لەگەڵ ڕاگەیاندنی ئەوەدا كە "یەزدان مردووە" لە شاری تۆرینۆ دوچاری شێتی دەبێت.

ڤیتگنشتاین "نامەی مەنتیقی – فەلسەفی"ی خۆی چاپدەکات و لافی ئەوە لێدەدات کە دوا ڕێگەچارەی کێشەکانی فەلسەفەی دۆزیوەتەوە.

دەیەی ١٩٢٠ ئەڵقـــــەی ڤیـــــەننا بانگەشە بۆ پۆزیتیڤیزمی مەنتیقی دەکات.

هایدیگەر کتێبی "بوون و زەمەن" چاپدەکات کە باس لە جیابوونەوەی فەلسەفەی شیکاری و فەلسەفەی ئەوروپایی دەکات.

سارتەر بە بڵاو کردنەوەی کتێبی "بوون و نەبوون" بیرو ڕاکانی هایدیگەر تەواو دەکات و فەلسەفەی بوونگەرایی (وجودیەت) دەخاتە ڕوو.

١٩٥٣ بڵاوبوونەوەی کتێبی "لێکۆڵینەوەی فەلسەفی"ی ڤیتگنشتاین پاش مەرگی خۆی. لووتکەی قۆناغی شیکاریی زمان (یان زمانشیکاری).

# ساڵنامەی ژیانی کیرکەگۆر

١٨١٣ لـــەدایکبوونی لـــە کۆپنهاگن

١٨٣٠ قوتـابیی خوداناسـی لە زانکۆی کۆپنهاگن

١٨٣٤ مەرگی دایکی

١٨٣٧ یەکـەمین دیـدار لەگـەڵ ڕێژین ئۆڵسنی تەمەن چواردە ساڵ

١٨٣٨ مەرگی باوکی

١٨٤٠ خـــوازبێنی کردنـــی ڕێژین

١٨٤١ هەڵوەشـــــاندنەوەی دەزگیرانێتی، چوون بۆ بەرلین

١٨٤٢ بڵاوکردنەوەی "یان ئەم یان ئەو"

١٨٤٣ بڵاوکردنەوەی "ترس و لەرز"

١٨٤٤ بڵاوکردنەوەی "چەمکی ترس"

١٨٤٦ مشتومڕ و ناکۆکی لەگەڵ گۆڤاری تەنزئامێزی "کۆرسیر"دا

١٨٤٨ ئەو ئەزموونە ئاینییەی کە سروشتی دەگۆڕێت و سەرنجی بەلای قسەی خوادا ڕادەکێشێت.

١٨٤٩ بڵاوکردنەوەی "نەخۆشی تامردن"

١٨٥٤ مشتومڕ و ناکۆکیی لەگەڵ کڵێسادا

١٨٥٥ دەرکردنی گۆڤاری "چرکەسات" کە بە وتارەکانی خۆی دژ بە کڵێسا پڕی دەکردەوە. دوا دیدار لەگەڵ ڕێژیندا. کۆچی دوایی لە هەمان ساڵدا.

# ساڵنامەی سەردەمی كيركەگۆر

١٨١٣ مايەپووچـــــــــــبوونی

دەوڵەتی دانيمـارك دەبێتـە هـۆی بـەربادبوونی بـاری ئابووری، بەڵام باوكی كيركەگۆر بە سەرمايەگوزاری لە ڕێـی كڕينـی دراوی كاغـەزينی دەوڵەتييـەوە لێـی قوتار دەبێت.

١٨١٣ لەدايكبوونی ڤاگنەر

١٨١٥ شـــــەڕی واتــــــەرلو.

ئيمپراتۆريـەتی بـەريتانيا دەسـت بەسـەر هـەموو هيندستاندا دەگرێت.

١٨٢١ فــارادای سەرچــاوەی

هێزی بزوێنی ئەلكتريك ئەدۆزێتەوە.

١٨٢٥ پەیـــدابوونی ڕێـــی ئاسنین. ستیڤنسـن ڕێگـای ئاسـنی دارلینگتـۆن-ستاکتۆن دەکاتەوە.

١٨٢٩ بـــەریتانیا تـــەواوی دوورگەی ئوسترالیا داگیر دەکات.

١٨٣٠ ســـــــەربەخۆبوونی یۆنان لەدەست ئیمپراتۆریەتی عوسمانی

١٨٣١ مردنـی هیگل بـه پـەتا لــه بــەرلین. داروینــن بــه کەشــتیی بیگــل بــەرەو دوورگەکانی گالاپاگۆس دەچێت.

١٨٣٢ مردنی گۆتە لە ڤایمار

١٨٣٤ دەوڵەتـەکانی ئـەڵمانیا یەکێتیـەکی گـومرگی پێکـدەهێنن، کـه یارمـەتیی دروســتبوونی شۆڕشــی پیشەســازی دەدات لــه کیشوەری ئەوروپادا

١٨٤٤ لەدایکبوونی نیچە

١٨٤٥ کۆمـــاری تەکســـاس دەخرێتە سەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

١٨٤٨ شەپۆلی شۆڕشەکان لە ئــەوروپا، مەکســیك، ئــەمریکا، دەبێتــە هــۆی

سپاردنی باشووری خۆرئاوا (کە کالیفۆرنیاش دەگرێتەوە) بە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

١٨٥٠ شـــــــــــۆپنهاوەری فەیلەسووفی سەرسەختی دژە هیگلی ناوبانگێکی درەنگ دەردەکات.

١٨٥٣ تا ١٨٥٦ شەڕی قرم

١٨٥٦ لەدایکبوونی فرۆید

# چەند کتێبێکی پێشنیازکراو بۆ خوێندنەوە

**1-Robert Bretall, ed., A Kierkegaard Anthology, (Princeton University Press, 1973)**
**2-Patrick L. Gardiner, Kierkegaard (Oxford University Press, 1988)**
**3-David J. Gonwens, Kierkegaard as Religious Thinker (Cambridge University Press, 1996)**
**40Bruce H. Kirmmse, ed., Encounters with Kierkegaard (Princeton Uneversity Press, 1996)**
**5-Roger Poole, Kierkegaard: The Indirect Communication (Uneversuty Press of Virginia, 1993)**

ئەم کتێبە لە ڕووی وەرگێڕانە فارسییەکەوە کراوە بە کوردی کە ئەمەیە:

آشنایی با کیرکیگور

پل استراترن، ترجمهٔ: علی جوادزاده، نشر مرکز چاپ اول ١٣٧٨- تهران

# کتێبە چاپکراوەکانی تری وەرگێڕ

بەکوردی:

چاوەکانی (ڕۆمان)_بوزورگی عەلەوی

نەورەس (کورتە ڕۆمان)_ڕیچارد باخ

خـــەونێك لـــەولاّتی پیــاوە بچــکۆلەکاندا (کورتە چیرۆکی جیهانی)

بــەناوی ژیانــەوە(چــاپی یەکــەم ١٩٩٧) ئەریك فرۆم

شــۆڕش یــا ڕیفــۆرم (گفتوگــۆ لەگــەڵ مارکۆزو پۆپەردا)

پیــــدرۆ پـــــارامۆ (ڕۆمـــــان)_خـــــوان ڕۆڵفۆ_(بەهاوکاری لەگەڵ ڕێبوار سیوەیلیدا)

چەند وێستگەیەکی فیکریو ئەدەبی(وتار و باسی فیکری و ئەدەبی)

تریفەی تەنیایی (ژیانو شیعری سوهراب سپهری)

تورکیـا لەسـەردەمی گۆڕانـدا _محەمـەد نورەدین

لەگـــەڵ ئـــەقڵی خۆرئـــاوادا (چـــەند گفتوگۆیەکی فەلسەفی و ئەدەبی)

نیچە _ پۆڵ ستراتێرن

ژنیٚ لەبـەردەم وەرزێکـی سـارددا (ژیـان و شیعری فروغ فەروخزاد)

سارتەر_پۆڵ ستراتێرن

مۆدێرنەکان_رامین جەهانبەگلو

بەعەرەبی:

مضیق الفراشات (قصیدة طویلة للشاعر الکردی شیرکو بیکەس)

ترجمة آزاد البرزنجي، دار الرازی –بیروت– لبنان.

عــار تمامــاَ کالمــاء (مختــارات شــعریه لـدلاوەر قرەداغـی)– ترجمـة آزاد البرزنجـی، دار الطلیعة الجدیدة – سوریا – دمشق.

سِــفرالروائح (قصــیدة طویلــة للشــاعر شـــیرکو بیکـــەس) – ترجمـــة آزاد البرزنجـــی، دارنینوی –دمشق –سوریا.